# تەفسیری

# پێشین

## جوزئی یەکەم

ئامادەکردنی

عثمان أحمد حاتم

# تەفسیری

# پێشین

## جوزئی یەکەم

ئامادەکردنی

عثمان أحمد حاتم

# پێشەکی

قورئان کۆتا پەیامی خودایە بۆ هەموو مرۆڤ وجن ، وپارێزراوە لـە هەموو گۆڕانکارییەك ، پێویستە لـەسەر هەموو موسڵمانان پەیڕەوی لـێبکەن ، ولـە مانا ومەبەستەکانی تێبگەن بۆ ئەوەی خۆشبەختی دونیا وسەرفرازی قیامەت بە دەست بهێنن ، لـەو سۆنگەیەوە تێگەیشتن لـە قورئان گرنگییەکی ئێجگار زۆری هەیە بۆ ژیانی موسڵمانان .

قورئان هاوشێوەی هیچ کتێبێکی تر نییە ، چونکە فەرموودەی خودای پەروەردگارە ، ولـە قسەی مرۆڤەکان ناچێت ، وخوێندنەوەی پەرستش ویادی خودایە ، الترمذی لـە ئیبن مەسعودەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : هەرکەسێك پیتێك لـە کتێبەکەی خودا بخوێنێتەوە ئەوە چاکەیەکی بۆ هەیە ، وپاداشتی هەر چاکەیەکیش بە دە هێندە دەدرێتەوە ، ناڵێم : ﴿الٓمٓ﴾ پیتێکە بەڵکو : ألف پیتێکە ، ولام : پیتێکە ، ومیم پیتێکە ؛ پێویستە موسڵمانان گرنگییەکی زۆر بە خوێندنەوە وفێربوون وفێرکردنی قورئان بدەن ، چونکە بوخاری لـە عثمانەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : باشترینتان ئەوانەتانن کە فێری قورئان دەبن وخەڵکیش فێردەکەن .

قورئانی پیرۆز چەند ناوێکی هەیە کە باوترینیان قورئانە خودا دەفەرموێت : ﴿إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ٣﴾(الزُّخْرُف) ، و"الکتاب" خودا دەفەرموێت : ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ٩٢﴾(الأَنعَام) ، و"الفرقان" : واتە جیاکەرەوەی ڕاستی لە پووچەڵ ونارەوا خودا دەفەرموێت : ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ١﴾(الفُرْقَان) ، و"الذکر" : خودا دەفەرموێت : ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ٩﴾(الحِجْر) .

وبە ماوەی بیست وسێ ساڵ دابەزیوەتە سەر پێغەمبەری خودا ﷺ کە سیازدە ساڵی لە مەککە ودە ساڵی لە مەدینە بووە ، وسی(جزء) و(سەد وچواردە) سورەتە ، وشەی (سورة) بە مانای ڕوونی وبەرز وبڵندی دێت ، یان بە مانای شورا وەك شورای شارەکان لەبەر ئەوەی هەموو ئایەتەکانی سورەتەکە لە خۆی دەگرێت ، ووشەی (آیة) مانای نیشانەیە ؛ القرطبی دەڵێت : زانایان یەك دەنگن کە هیچ وشەیەکی لێکدراوی (أعجمی) واتە : جگە لە عەرەبی لە قورئاندا نییە ، ودیسان یەك دەنگن کە هەندێك ناوی تێدایە کە عەرەبی نییە وەك (إبراهیم) ، و(نوح) ، و(لوط) ، وناکۆکن ئایا جگە لەوە هیچی تری ئەعجەمی تێدایە ؟ ، الطبری نکولی ئەوە دەکات ودەڵێت : هەر وشەیەکی تێدابێت کە هاوواتای وشەیەکی ئەعجەمی بێت ئەوە لە بابەتی ئەو وشانەیە کە زمانەکان لەسەری

کۆکن وبەهەمان شێوە بەکاری دەهێنن ، ڕیزبەندی پیتەکان ووشەکان وئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لە لایەن پێغەمبەری خوداوە ﷺ دیاری کراوە ، دروست نییە بۆ هیچ کەسێك پاش وپێش لە پیتێك یان وشەیەك یان ئایەتێکی قورئاندا بکات ، ئەحمەد والترمذی وئەبوداود لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : بە عثمانی کوڕی عەفانم رضي الله عنه وت : چی پاڵنەرتان بوو سورەتی ئەنفال کە لە سورەتە درێژەکان نییە وئایەتەکانی لە سەد ئایەت کەمترە لە ڕیزبەندی حەوت سورەتە درێژەکە دابنێن ، ولەگەڵ سورەتی تەوبە کە ئایەتەکانی لە سەد ئایەت زیاترە پێکەوە کۆیان بکەنەوە ، و﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ لەنێوانیاندا نەنوسن ولە دوای ئەنفالەوە داتانناوە ؟ ، عثمان رضي الله عنه وتی : پێغەمبەری خودا ﷺ لە کاتێکدا ئەو سورەتانەی کە ئایەتەکانی زۆرن وهەندێك لە ئایەتەکانی بۆ دادەبەزی بانگی ئەو کەسانەی دەکرد کە قورئانیان دەنوسیەوە ودەیفەرموو : ئەم ئایەتانە بخەنە نێو ئەو سورەتەی کە باسی ئەو شتە وئەو شتە دەکات ، وئەگەر ئایەتێکی بۆ دابەزیبایە دەیفەرموو : ئەم ئایەتە بخەنە نێو ئەو سورەتەی کە باسی ئەو شتە دەکات ، سورەتی ئەنفال لەو سورەتانە بوو کە لە سەرەتای کۆچی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ مەدینە دابەزی ، وسورەتی تەوبە لە کۆتاییەکاندا دابەزی وباسەکانیان لە یەك دەچوون گومانم وابوو کە یەك باسن ، پێغەمبەری خودا ﷺ وەفاتی کرد وبۆی دیاری نەکردین کە یەك باسن یان جیاوازن لەبەر ئەوە پێکەوە کۆم کردنەوە ، و﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ لە نێوانیاندا نەنووسی ، ولە ڕیزبەندی حەوت سورەتە گەورەکە دامناوە .

زانایان ناکۆکن ئایە هەموو سورەتەکان پێغەمبەری خودا ﷺ ناویناون ؟ لە فەرموودەی صەحیحدا جێگیر بووە کە پێغەمبەری خودا ﷺ ناوی چەند سورەتێکی هێناوە وەك الفاتحه والبقره وآل عمران والكهف وهود والواقعه والمرسلات ، هەندێك لە زانایان دەڵێن : ناوی هەموو سورەتەکان لە فەرموودە وئەسەرەکان هاتووە ، وناوی هەموو سورەتەکان لە سەردەمی هاوەڵانەوە باوبووە ، لەبەر ئەوە نابێت جگە لەو ناوانەی کە لە موصحەفی عثماندا رضي الله عنه هاتووە ناوی تر لە سورەتەکانی قورئان بنرێت ، کەواتە : بۆچوونی دروست ئەوەیە کە ناوی هەندێك لە سورەتەکان پێغەمبەری خودا ﷺ ناوی ناون وئەوانی تر هاوەڵان ناویان ناوە ولەو سەردەمەوە بووەتە جێی کۆ دەنگی هەموویان ، وسورەتەکان هەندێکی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕیزبەندی کردووە وهەندێکی هاوەڵان دایانناوە وئەو موصحەفەی کە پێشەوا عثمان رضي الله عنه کۆی کردەوە بووەتە جێی کۆدەنگی هاوەڵان رضي الله عنهم .

ئیبن کثیر دەڵێت : ژمارەی ئایەتەکانی قورئان شەش هەزار ئایەتە ، لەوە زیاتر زانایان ناکۆکن ، هەیانە دەڵێن : لەوە زیاتر نییە ، وهەیانە دەڵێن : شەش هەزار ودووسەد وچوار ئایەتە ، ووتراوە : دووسەد وچواردە ، ووتراوە : ودووسەد ونۆزدە ، ووتراوە : دووسەد وبیست وپێنج ، ووتراوە : دووسەد وبیست وشەش ، ووتراوە : دووسەد وسی وشەش ، ئەبوعومەری الدانی ئەوەی لە کتێبی البیاندا گێڕاوەتەوە .

ژمارەی وشەکانی قورئان الفضلی کوڕی شاذان لە عطا کوڕی یەسارەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت : حەفتا وحەوت هەزار وچوار سەد وسی ونۆ وشەیە .

ژمارەی پیتەکانی عبداللەی کوڕی کثیر لە مجاهدەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت : ئێمە ژماردوومانە : سێ سەد وبیست ویەك هەزار وسەد وهەشتا پیتە ، والفضل لە عطای کوڕی یەسارەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت : سێ سەد وبیست وسێ هەزار وپازدە پیتە ، وسەلام ئەبومحمد الحمانی دەڵێت : حەجاج هەموو قورئان خوێن وئەوانەی قورئانیان لەبەر بوو وئەوانەی قورئانیان دەنوسییەوە کۆی کردنەوە وپێی گوتن : هەموو قورئان بژمێرن بزانن چەند پیتە ؟ دەڵێت : ژماردمان ، هەموویان کۆ دەنگ بوون کە سێ سەد وچل هەزار وحەوت سەد وچل پیتە .

هۆکاری ئەو جیاوازییەشیان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە هەندێك لە زانایان (بسم الله) وپیتە پچڕاوەکان یان پێغەمبەری خودا ﷺ لە هەندێك شوێن لەسەر ئایەتێك وەستاوە بە ئایەتیان ژماردووە ، وهەندێك بۆچوونیان پێچەوانەی ئەوەبووە ، بۆیە ئەو ناکۆکییە لە سەر زیاتر لە شەش هەزار ودووسەد ئایەتەکە دروست بووە ، بەڵام ئەوەی کە ئاشکرایە ئەو ناکۆکییە هیچ کاریگەرییەکی نییە ، چونکە هەمووان یەك دەنگن کە یەك پیت ویەك وشە لە موصحەفەکەی پێشەوا عثمان رضي الله عنه کەم وزیادی نییە تەنها ناکۆکیان لە شوێنی دانانی ئایەتەکان وژمارەیانە .

شایانی باسە لەم پێشەكییەدا بە كورتی ئاماژەیەك بكەم بۆ پرسێك كە زۆر جار هەندێك لە خوێنەران بەر چاویان دەكەوێت ، وماناكەی لایان ڕوون نییە ، ئەویش پرسی : حەوت پیت وحەوت خوێندنەوەكەیە (الأحرف السبعة والقراءات السبع) ، بوخاری ومسلم لە عومەری كوڕی خەتابەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت : گوێم لە هشام كوڕی حەكیم كوڕی حزام رضي الله عنهما بوو ، سورەتی الفرقانی دەخوێندەوە كۆمەڵە وشەیەكی خوێندەوە ، پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم بەو شێوەیە بۆ منی نەخوێند بوو ، خەریك بوو نوێژەكەی پێ ببڕم ، بەڵام ئارامم گرت هەتاكو كۆتایی پێهێنا ، یەخەییم گرت وهێنام بۆ لای پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم ، وتم : ئەی پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم تۆ سورەتی الفرقانت بۆ خوێندمەوە ، ومن گوێم لە هشام بوو كۆمەڵە وشەیەكی دەخوێندەوە ، تۆ بۆ منت نەخوێندووەتەوە ، پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم فەرمووی : بخوێنە ئەی هشام ، قورئانی خوێندەوە بەو شێوەی كە عومەر رضي الله عنه گوێی لێ بوو ، پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم فەرمووی : بەم شێوەیە دابەزیوە ، پاشان فەرمووی : بخوێنە ئەی عومەر : خوێندمەوە ، فەرمووی : بەم شێوەیە دابەزیوە ، پاشان پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم فەرمووی : بێگومان قورئان لەسەر حەوت شێواز دابەزێنراوە ، بەو شێوەیەی دەیزانن وئاسانە بۆتان قورئان بخوێننەوە .

هەندێك لە خەڵك گومانیان وایە ئەو حەوت شێوازەی قورئانی لەسەر دابەزیوە حەوت خوێندنەوەكەیە ، وئەمەش بۆچوونێكی هەڵەیە ، ئەبوشامە دەڵێت : ئەو كەسەی

گومانی وابێت حەوت شێوازەکە ، حەوت خوێندنەوەکەیە ، پێچەوانەی کۆدەنگی هەموو زانایانە ، وئەوە گومانی هەندێك لە نەفامەکانە .

ئەو حەوت جۆرە خوێندنەوەی کە زانراو وباوە لای موسڵمانان ، کە هەر جۆرێکی بە ناوی بە ناوبانگترین خوێنەری ئەو جۆرەوە ناوبانگی دەرکردووە کە بریتین لە : نافعی مەدەنی ، وئیبن کثیری مەکی ، ئەبوعەمری کوڕی عەلائی بەصری ، وئیبن عامری شامی ، وعاصم وحەمزە والکسائی کوفی ، وهەریەکە لەو قورئان خوێنانە چەند کەسێك قورئانیان لەسەر دەستیان خوێندووە ، وخاوەن ڕێگە وخوێندنەوەی تایبەتن .

القرطبی لە پێشەکی تەفسیرەکەیدا باسی ناکۆکی زانایان دەکات سەبارەت بەو حەوت شێوازە (الأحرف السبعة) ودەڵێت : زانایان ناکۆکن کە مەبەست لەو حەوت شێوازە چییە ، سی وپێنج بۆچوونیان هەیە لە بارەیەوە ، کە ئەبوحاتەمی کوڕی حبان البستی باسی کردووە ؛ کە بەهێزترین وپەسەندترین ونزیکترینیان لە ڕاستییەوە بریتییە لە : یەکەم : مەبەست حەوت شێوازی دەربڕینی جیاوازە بە هەمان مانا ، وەك : (أقبل ، تعال ، هلم) ئەم وشانە ئەگەرچی شێوازیان جیاوازە بەڵام هەمان مانایان هەیە ، کە ئەمە بۆچوونی زۆربەی زانایانە ، وبێگومان مەبەست ئەوە نییە کە هەموو قورئان دەتوانرێت بە حەوت شێواز بخوێنرێتەوە ، بەڵکو هەندێك وشە بە مانایەك زیاتر تا حەوت مانا وشێواز دەخوێندرێتەوە ، وپێویستە بزانرێت ئەو دروستییەی خوێندنەوەی قورئان بەو شێوازە جیاوازانە بە حەز وئارەزوو نییە ، بەڵکو دەبێت بە صەحیحی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ ڕیوایەت کرابێت ،

ئیبن تەیمیە دەڵێت : موسڵمانان كۆدەنگن كە ئەو حەوت شێوازەی قورئانی لەسەر دابەزێنراوە ، دژیەك نین لە مانا ومەبەستەكانی ، بەڵكو لەوانەیە : هاومانابن یان ماناكانیان نزیك بێت لە یەكەوە ، وەك : ئیبن مەسعود رضي الله عنه دەڵێت : بێگومان وەك ئەو قسەی هەریەكە لە ئێوەیە كە بڵێت : (أَقْبِلْ وَهَلُمَّ وَتَعَالَ) ، یان دەشێت وشەیەك هەمان مانای وشەكەی تری نەبێت ، بەڵام هەردوو ماناكە ڕاست بێت ئەمەش ناكۆكی جۆرییە نەوەك دژیەكی ؛ دووەم : حەوت زاراوە لە قورئاندا هەیە كە هەموویان زاراوەی زمانی عەرەبین ، بۆ ئاسانكاری وقورس نەبوونی خوێندنەوەی لەسەر ئوممەتی ئیسلام بەو حەوت زاراوە دابەزیوە ، وبەڵگەش بە هاوشێوەی ئەو فەرموودەیە دەهێننەوە كە مسلم لە ئوبەی كوڕی كەعبەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی كردووە دەڵێت : لە مزگەوت دانیشتبووم ، كەسێك هاتە ژوورەوە ونوێژی كرد بە شێوەیەك قورئانی خوێندەوە نكولیم لێكرد ! ، پاشان كەسێكی تر هاتە ژوورەوە بە شێوەیەكی جیاوازتر لەو كەسەكەی تر قورئانی خوێندەوە ! ، كاتێك نوێژەكەمان بەجێهێنا ، هەموومان ڕۆیشتین بۆ لای پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم ، وتم : ئەم كەسە بەشێوازێك قورئانی خوێندەوە نكولیم لێكرد ، وئەویتر بەشێوازێكی جیاوازتر لە خوێندنەوەی كەسی یەكەم قورئانی خوێندەوە ، پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێكردن ، قورئانیان خوێندەوە ، وشێوازی خوێندنەوەكەیانی بەباش دانا ، گومانم بۆ دروست بوو زیاتر لەو گومانەی لەسەردەمی نەفامی لە ناخمدا بوو ! ، كاتێك پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم بینی ئەو گومانەم بۆ دروست بوو ، دای لەسەر سنگم ، لە شەرم وترسدا هەموو گیانم ئارەقی كرد وەك ئەوەی سەیری خودا عز وجل بكەم ، پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووم :

ئەی ئوبەی : سروشم بۆ کرا کە قورئان بە یەك شێواز بخوێنمەوە ، وەڵامی جبریلـم ﵇ دایەوە کە بە خودا ﷻ ڕابگەیەنێت ئاسانکاری بکات بۆ ئوممەتەکەم ، گەڕایەوە بۆ لام فەرمووی : بە دوو شێواز بیخوێنەوە ، وەڵامی جبریلـم ﵇ دایەوە کە بە خودا ﷻ ڕابگەیەنێت ئاسانکاری بکات بۆ ئوممەتەکەم ، وەڵامی دامەوە لـە جاری سێیەمدا : کە بە حەوت شێواز بیخوێنمەوە .

تەفسیری پێشین هەوڵێکە بۆ تێگەیشتن لـە مانای ئایەتەکانی قورئان ، بە گوزارشت ودەربڕینێکی سادە وئاسان بە زمانێکی کوردی پاراو وپەتی ، ودوور لـە درێژ بڕییەك کە ببێتە هۆکاری دروست کردنی بێزاری لای خوێنەر وکورت بڕییەك کە مانا ومەبەستی پێویست نەدات بە دەستەوە ، هەڵبژاردنی ناوی پێشین بەو هیوایەیە کە هاومانای تەفسیرەکانی پێشەوایانی سەلەف بێت وهەردەم ئەو وتەیەی پێشەوا ئەحمەد بەیاد دەهێنمەوە کە دەڵێت : شتێك مەڵێ کە پێشەوایەك ئەو بۆچوونەی پەسەند نەکردبێت .

کتێبخانەی کوردی هەژارە لـە ڕووی سەرچاوەی تۆکمە وڕاست ودروست بۆ تێگەیشتن لـە قورئان لـەسەر ڕێبازی پێشینان ، وزانراوە کە باشترین ڕێگە بۆ لـێکدانەوەی قورئان تەفسیرکردنیەتی بە ئایەتەکانی قورئان وفەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ چونکە هەندێك جار بابەتێکی لـە شوێنێکدا بە کورتی یان بە ڕەهایی یان بە گشتی باسکراوە ولـە شوێنێکی تر ئەو باسە زیاتر ڕوون کراوەتەوە یان وابەستەکراوە یان تایبەت کراوە ، وهەروەها زانستی "ناسخ ومنسوخ" وهۆکاری دابەزینی ئایەتەکان ، ولـێکدانەوەی

هاوەڵان بە تایبەت ئیبن عەباس ﵄ چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ لە خودا بۆی پاڕاوەتەوە ونزای بۆ کردووە کە فێری لێکدانەوە وتەفسیری قورئانی بکات ، ولێکدانەوە وتەفسیری زانا گەورە وبە ناوبانگەکانی ئەهلی سوننەت وجەماعەت ، چونکە دڵنیام لە تەفسیردا ئەوان هیچ بوارێکیان بۆ داهێنان وزیادە خستنە سەر بۆ دوای خۆیان نەهێشتووەتەوە ، وهەمووان پێویستمان بە هەڵدانەوەی لاپەڕەی تەفسیرەکانی زانایانی سەلەف هەیە ، لەبەر ئەوە سەرچاوەی ئەم تەفسیرە هەموو ئەو شاکارانەیە کە ئەوان نوسیویانەتەوە .

لە تەفسیری پێشیندا سودی زۆرم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە ، (جامع البيان)ئیبن جەریری الطبری (٣١٠هـ) ، (تفسير القرآن العظيم مسندًا) ئیبن ئەبوحاتەمی ڕازی (٣٢٧هـ) ، (الكشف والبيان) الثعلبی (٤٢٧هـ) ، (التفسير البسيط)و(الوجيز) الواحدی (٤٦٨هـ) ، (معالم التنزيل) البغوي (٥١٦هـ) ، (زاد المسير) ئیبن الجوزی (٥٩٧هـ) ، (الجامع لأحكام القرآن) القرطبی (٦٧١هـ) ، (التسهيل لعلوم التنزيل) ئیبن جزی الكلبی (٧٤١هـ) ، (تفسير القرآن العظيم) ئیبن كثير (٧٧٤هـ) ، (الدر المنثور) السيوطی (٩١١هـ) ، (فتح القدير) الشوكانی (١٢٥٠هـ) ، (روح المعانی) الآلوسی (١٢٧٠هـ) ، (فتح البيان) صديق حسن خان القنوجی (١٣٠٧هـ) ، (تيسير الكريم المنان) السعدی (١٣٧٦هـ) ، (أضواء البيان) الشنقيطی (١٣٩٤هـ) ، (تفسير القرآن الكريم) ئیبن عثيمين

(١٤٢١هـ) ، هەروەها سودم لە هەموو کتێبەکانی شێخی ئیسلام ئیبن تیمیە (٧٢١هـ) وپێشەوا ئیبن القیم (٧٥١هـ) وەرگرتووە .

هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئایەتەکانم دیاری کردووە ، دەقی فەرموودەکانم بە عەرەبی نەهێناوە لەبەر ئەوەی زۆر درێژ نەبێتەوە ، وزۆرجاریش تەنها شوێنی مەبەستم هێناوە ، وفەرموودە ئەگەر بوخاری ومسلم یان یەکێکیان ڕیوایەتیان کردبێت کەسی ترم لە فەرموودەناس لەگەڵ باس نەکردوون بۆ سودێك نەبێت کە لە ڕیوایەتی جگە لە بوخاری ومسلمدا هاتبێت ، وبۆ فەرموودەکانی تر پشتم بەستووە بە کتێبەکانی ئەلبانی وئیبن حەجەر وئیبن کثیر والشوکانی وئەحمەد شاکر ومقبل الوادعی ، ئەگەر فەرموودەیەك قسەی ئەو فەرموودەناسانە لێکۆڵەرانەم دەست نەکەوتبێت لەسەری ناوم نەهێناون کە ئەمە زۆر بەکەمی دەبینرێت وبۆسود ومەبەستێك وزیاتر تێگەیشتنە لە مانای ئایەتەکە هێناومە ، وبۆ ناوی خودای پەروەردگار لە هەر شوێنێکدا ماناکانی بخوازێت یان لە دەقی وەرگێڕاودا هاتبێت (ﷻ ، ﷻ ، ﷻ) نوسیووە ، بۆ ناوی پێغەمبەری خودا (ﷺ) نوسیووە ، وبۆناوی پێغەمبەرانی تر ﵇ یان ﵉ نوسیووە ، بۆ هاوەڵان (﵁ ، ﵄ ، ﵄ ، ﵃) نوسیووە ، وبۆ زانایان (رحمه الله)م بەکار نەهێناوە لەبەر زۆر دووبارەبوونەوەی ناوەکانیان ، وکاتێك دەڵێم فلانە زانا وادەڵێت ناوی سەرچاوەکەم نەنوسیووە وەك زانایانی پێشین ، چونکە دیاری کردنی سەرچاوە ونۆرەی چاپ وژمارەی لاپەڕە لەم سەردەمانەی دواییدا دایان هێناوە وشێوازێکی ئەکادیمییە ، وئەوەش لەبەر ترسی

دزی زانستییه "السرقة العلمية" ، ومەرج نییە دەقاودەق قسەکەیم هێنابێت بەڵکو مانا ومەبەستەکەم نوسیووە ، چونکە ئەگەر دروست بێت لێکدانەوەی مانای ئایەتەکانی قورئان بکرێت یان بە مانا فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ بگێڕدرێتەوە بێگومان دروستە بە مانا قسەی زانایان وەربگێڕدرێت ، وئەگەر لە شوێنێکدا مانای قسەی زانایەکم نوسیبێت ودەستکاری زۆرم کردبێت نەمداوەتە پاڵ زاناکە ، وبۆ لێکدانەوەی ناو وسیفەتەکانی خودا ﷻ سودم لە کتێبەکانی زانستی بیروباوەڕ بە تایبەت کتێبەکانی شیخ ئیسلام ئیبن تەیمیە وپێشەوا ئیبن عثیمین وەرگرتووە ، وبۆ حوکمە فیقهییەکان وابەستەی هیچ مەزهەبێك نابم بەڵکو بە رێزەوە دەڕوانمە ئیجتیهاد وڕای زانایان وپێشەواکانی سوننەت وهەر وتە وبۆچوونێك پێچەوانەی سوننەتی صەحیح بێت وەرینا گرم .

عثمان أحمد حاتم

باشوری کوردستان ـ گەرمیان ـ کەلار

٩/شوال/١٤٤١ك

٢٠٢٠/٦/١

﴿أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ پەنا دەگرم بە خودا لە شەیتانی نەفرەت لێکراو ولە خێر بە دوورکراو .

پێش دەستپێکردنی خوێندنەوەی قورئان فەرمانکراوە بە خوێندنی : ﴿أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ بۆ دوورخستنەوەی وەسوەسە ودڵەڕاوکێی شەیتان ، خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ۝٩٨﴾(النَّحل) ؛ وهەروەها لە نوێژدا پێغەمبەری خودا ﷺ خوێندویەتی ، ئەحمەد وئیبن ماجە لە عبداللەی کوڕی مسعودەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر دەستی بە نوێژ بکردایە دەیفەرموو : ((اللَّهمَّ إنِّي أعوذُ بكَ منَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ وهَمزِهِ ونفخِهِ ونفثِهِ)) ، هەندێك لە زانایان خوێندنی لە نوێژدا بە واجب دەزانن ، بەڵام جمهوری زانایان دەڵێن سوننەتە ، وناکۆکن ئایا لە هەموو ڕکاتەکاندا دەخوێندرێت یان تەنها لە ڕکاتی یەکەمدا دەخوێندرێت ، النووی دەڵێت : لە مەزهەبی شافعیدا لە هەموو ڕکاتەکاندا دەخوێندرێت ئەم ڕایەش بە هێز وپەسەندترە ؛ وبە چەند شێوازێکیش هاتووە ، القرطبی دەڵێت : ﴿أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ ئەم شێوازە هەڵبژاردەی جمهوری زانایانە بۆ پەناگرتن بە خودا لە شەیتان چونکە ئەو شێوازە لە قورئاندا هاتووە ، وهەروەها : ((أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)) و((أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ، مِنْ هَمْزِهِ ، وَنَفْخِهِ ، وَنَفْثِهِ)) ، واتە : پەنا دەگرم بە خودای بیسەر وزانا لە شەیتانی نەفرەت لێکراو ولە خێر بە دوورکراو ، لەوەی تووشی پەرکەم ولەخۆبای بوون وشیعری نەشیاوم بکات ، لە فەرموودەی صەحیحدا هاتوون .




## ﴿سُورَةُ الفَاتِحَةِ﴾

سورەتی الفاتحە لە شاری مەککە دابەزیوە ، وپێی دەگوترێت الفاتحە واتە : دەستپێك لەبەر ئەوەی لە نوێژدا دەبێت یەکەم جار بە خوێندنەوەی ئەم سورەتە دەست پێبکرێت ، یان ئەوەی لە سەرەتای قورئاندا نوسراوەتەوە ، ژمارەی ئایەتەکانی حەوت ئایەتە ، زانایان ناکۆکن ئایا (بسم الله) ئایەتێکی سەربەخۆیە لە ئایەتەکانی یان بەشێکە لە ئایەتێك ، یان ئایەت نییە بەڵکو بۆ جیاکردنەوەی سورەتەکانە لە یەکتر ، ئەبوداود والترمذی لە ئوم سەلەمەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ ڕیوایەتیان کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ لە نوێژدا ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ی خوێندووە وبە ئایەتێکی داناوە ، وچەند ناوێکی هەیە باوترینیان (الفاتحة)یە ، و(الحمد)، و(أم القرآن) ، و(السبع المثاني)یشی پێدەگوترێت.

فەرموودەی زۆر دەربارەی فەزڵ وگەورەیی هاتووە ، بوخاری لە ئەبوسعیدی کوڕی المعلی ﵁ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ بەلامدا تێپەڕی نوێژم دەکرد بانگیکردم وەڵامم نەدایەوە هەتا نوێژەکەم تەواوکرد پاشان هاتم بۆ لای ، فەرمووی : چی ڕێگری لێ کردیت کە بانگم کردیت نەهاتیت ؟ ، وتم : نوێژم دەکرد ، فەرمووی : ئایا خودا نەیفەرمووە : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡ ٢٤﴾ (الأَنفَال) ،

پاشان فەرمووی : ئایا گەورەترین سورەتت لە قورئان فێرنەکەم ، پێش ئەوەی لە مزگەوت بچمە دەرەوە ؟ ، پێغەمبەری خودا ﷺ ویستی لە مزگەوت دەربچێت بیرم خستەوە ، فەرمووی : ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ئەوە (السبع المثاني) وقورئانی مەزنە کە پێم بەخشراوە.

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١﴾ بە ناوی خودای میهرەبانی بە بەزەیی .

بە ناوی خوداوە دەست پێدەکەم بە هەموو ناوێك لە ناوە جوانەکانی خودای پەروەردگار ، ئیبن عەباس رضي الله عنهما دەفەرموێت (الرحمن الرحیم) دوو ناوی یەك لەیەك ناسکترن ، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خودا خاوەن بەزەیی وسۆزێکی زۆر فراوانە ، (الرحمن) خاوەن ڕەحمەتێکی فراوانە ، و(الرحیم) ڕەحم دەکات بە هەرکەس لە بەندەکانی کە بیەوێت ، ئەبوداود لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردوە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ نەیدەزانی سورەتێك کۆتایی هاتوە هەتا ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ی بۆ دادەبەزی .

﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ سوپاس وستایش بۆ خودای پەروەردگاری هەموو بوونەوەر .

سوپاس بۆ خودا لەسەر ئەو هەموو نازونیعمەتانەی پێی بەخشیوین ولە ژماردن نایەن ، تەنها خودا هەموو دروستکراوەکانی پەروەردە دەکات وهەموو ئامرازێکی ژیانی بۆ فەراهەمکردون .

﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ۝٣﴾ خاوەن بەزەیی ومیهرەبانییەکی فراوانە وڕەحم دەکات بە هەرکەس لە بەندەکانی کە بیەوێت .

﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤﴾ خودا پادشا وخاوەنی ڕۆژی لێپرسینەوەیە .

﴿يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی قیامەت ، خودای پەروەردگار خاوەنی ڕۆژی قیامەت وهەموو ڕۆژەکانی تریشە ، بەڵام لێرە لەبەر گرنگی ئەو ڕۆژە تایبەتی کردووە ، ئیبن عەباس رضي الله عنهما دەڵێت : کەس لەو ڕۆژەدا خاوەنی هیچ نییە وەك لە دونیادا خەڵك خاوەنی هەندێك شتن .

﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥﴾ بە تەنها تۆ دەپەرستین ، وبە تەنها داوای یارمەتی لە تۆ دەکەین .

پێش خستنی بەرکار بەسەر کارەکەیدا ئەو کارە تایبەت دەکات بە خاوەن کارەکەوە وەك ئەوەی بڵێیت : تەنها تۆ دەپەرستین وکەسی تر نا پەرستین ، وتەنها داوای یارمەتی لە تۆ دەکەین وداوای یارمەتی لە کەسی تر ناکەین .

﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ هیدایەتمان بدە وڕێنماییمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست .

ڕێگای ڕاست بریتییە لە ڕێگای یەکتاپەرستی ودوورکەوتنەوە لە هاوبەش بڕیاردان وهاوبەش بڕیاردەران ، کە ئەمە ئەو ڕێگایەیە هەرکەس بیگرێتە پێش چارەنوسی بەهەشتە ، وهەرکەس پشتی لێ هەڵبکات چارەنوسی دۆزەخە .

﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧﴾ ڕێگەی ئەو کەسانەی نازونیعمەتت بەسەردا ڕشتوون کە پێغەمبەران وڕاستگۆکان وشەهیدەکان وپیاوچاکانن ، وبە دوورمان بگرە لە ڕێگەی ئەوانەی بەر تووڕەیی کەوتوون ، وڕێگەی ئەوانەشی کە لادەر وگومڕان .

ئەوانەی بەر تووڕەیی کەوتوون جوولەکەکان بوون کە ئاینی خودایان دەزانی وبەئەنقەست سەرپێچییان دەکرد ، وئەوانەش کە لادەر وگومڕابوون گاورەکان بوون کە بە نەفامی ونەزانینەوە خودا پەرستییان دەکرد ، ئەم ئایەتە سەرنجی موسڵمانان بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کە بە دووربن لە هەموو ئەو هۆکارانەی کە دەبێتە هۆکاری تورەبوونی خودای پەروەردگار ، وهەروەها نابێت موسڵمان بە ئەنقەست پێچەوانەی فەرمانەکانی خودا وپێغەمبەرەکەی ﷺ بکات ، ویاساغیکراو وسنورەکانی خودا ببەزێنێت ، ونابێت بە نەفامی ونەزانینەوە خوداپەرستی بکات ، ودەبێت نەشلڕەو ونەتوندڕەو بێت ، بەڵکو دەبێت مامناوەند ودادگەر بێت ، بەو شێوەیەی کە ئاینی ئیسلام پێی هاتووە .

بوخاری ومسلم لە ئەبوهریرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : ئەگەر پێشنوێژ وتی (آمین) ئێوەش بڵێن (آمین) ، چونکە هەرکەس وتنی (آمین)ەکەی لەگەڵ وتنی (آمین)ی فریشتەکان تەبابێت ویەکبگرێت ، خودا سبحانه وتعالى لە تاوانەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت ، وهەروەها بوخاری لە ئەبوهریرەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : ئەگەر پێش نوێژ وتی: ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ بڵێن : (آمین) ، کە مانای ئەوەیە : پەروەردگارا وەڵامی نزا وپاڕانەوەکانمان بدەرەوە ، چونکە هەرکەس وتنەکەی لەگەڵ وتنی فریشتەکان تەبابێت خودا لە تاوانەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت ، وئەبوداود لە وائلی کوڕی حجرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە وتی : ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ی بخوێندبایە دەیفەرموو (آمین) ودەنگیشی بەرز دەکردەوە ، ئیبن کثیر دەڵێت : سوننەتە لە دەرەوەی نوێژیش بەڵام لە نوێژدا زیاتر جەختی لێکراوەتەوە ، وهەروەها ئیبن بازیش دەڵێت : ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێت لە نوێژدابێت یان لە دەرەوەی نوێژ (آمین) دەخوێنێت کە مانای ئەوەیە خودایە وەڵامی پاڕانەوەکانمان بدەرەوە .




﴿سُورَةُ البَقَرَةِ﴾

لەبەر ئەوەی سورەتی البقرە باسی بەسەرهاتی ئەو مانگایە دەكات كە خودای پەروەردگار فەرمانی بە نەوەكانی یەعقوب عليه السلام كردبوو كە سەری ببڕن بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە ، ولە شاری مەدینە دابەزیوە ؛ ودرێژترین سورەتی قورئانی پیرۆزە ، وژمارەی ئایەتەكانی دوو سەد وهەشتا وشەش ئایەتە ، ئایەتی (الكرسي)ش كە گەورەترین ئایەتە لەم سورەتەدایە ، فەرموودەی زۆر دەربارەی فەزڵ وگەورەیی لەسەر هاتووە لەوانە :

مسلم لە ئەبوهریرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی كردووە كە پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : ماڵەكانتان مەكەنە گۆڕستان ، كە بە هیچ شێوەیەك قورئانی تێدا نەخوێنن ، چونكە هەر ماڵێك سورەتی بەقەرەی تێدا بخوێنرێت شەیتان ناچێتە ئەو ماڵەوە ، وديسان مسلم لە ئەبو ئومامەی الباهلیەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیكردوە دەڵێت گوێم لە پێغەمبەری خودابوو صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو : سورەتی البقرە بخوێنن ، چونكە خوێندن ولەبەركردن وگوێ لێگرتنی بەرەكەتە ، ووازلێهێنان ونەخوێندنەوە وگوێ لێنەگرتنی پەشیمانیە ، وجادووگەرەكان ناتوانن زیان بەوكەسانە بگەیەنن كە بە قەڵغانی ئەم سورەتە خۆیان قایم دەكەن .

﴿الٓمٓ ١﴾ بە (ألفْ ، لامْ ، میمْ) دەخوێندرێتەوە ، ئەو پیتە پچڕاوانەی کە لـە سەرەتای هەندێك لـە سورەتی قورئانی پیرۆزدا هاتوون زانایان لـێکدانەوەی جیاوازیان بۆ کردوون ، هەندێك دەڵێن : خودای پەروەردگار تەحەدای عەرەبی پێکردووە کە زۆر بە زمانزانی ورەوانبێژی خۆیان دەنازین پێی فەرموون : ئەم قورئانە لـەم پیتانەیە ، فەرموون ئەگەر ڕاست دەکەن کە محمد ﷺ خۆی ئەم قورئانەی نوسیوەتەوە ، قورئانێکی بەو شێوەیە یان چەند سورەتێك یان تەنها سورەتێکی وەك ئەم قورئانە بنوسنەوە ، کە بە دڵنیاییەوە هەرگیز ناتوانن شتێکی هاوشێوەی قورئان بهێنن یان بینوسنەوە ، چونکە زۆربەی ئەو سورەتانەی کە بەم پیتانە دەستپێدەکەن دوای ئەوە باسی قورئان دەکات ، یان لـە بارەیانەوە وتراوە : هەموو کتێبێك نهێنییەکی هەیە ئەم پیتانەش نهێنی قورئانە ، وهەندێکی دیکە پێیان وایە هەڵبژاردنی بێدەنگی باشترە لـە مەڕ ڕاڤەکردن وشیرکردنەوەی ئەم پیتانە بەبێ ئەوەی بەڵگەی شەرعی هەبێت وبگوترێت خودا زانایە بەوەی لـەبەر چ حیکمەتێك دابەزیون ، ویان وتراوە : ئەو پیتانە کۆمەڵە پیتێکن کە لـە ڕێنوسی زمانی عەرەبین ومانایان نییە ، بەڵام لـەوە دڵنیاین کە خودای پەروەردگار بێ حیکمەت داینەبەزاندوون ، هەموو ئەو بۆچوونانە دژیەکنین ، وبۆچوونی دروست وڕاست وپەسەند ئەوەیە کە ئەو پیتانە مانایان نییە ، بەڵام بێ حیکمەت خودا داینەبەزاندوون.

﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢﴾ ئەم کتێبە کە مەبەست قورئانە هیچ گومانی تێدا نییە کە خودای پەروەردگار دایبەزاندووە ڕێنمایی وبەرچاو ڕوونی تێدایە بۆ پارێزکاران .

کەسی پارێزکار بەو باوەڕدارانە دەوترێت کە سنورەکانی خودایان پاراستووە ونایانبەزێنن ، وفەرمانەکانی خودا وپێغەمبەرەکەی ﷺ جێبەجێ دەکەن بەگوێرەی توانایان ، وبەتەنها باسی لـە خودا ترسان وپارێزکاران کردووە لـەبەر ئەوەی هەرئەوانن بەڕاستی ودروستی سودی لـێدەبینن .

﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ۝٣﴾ ئەو کەسانەی باوەڕیان بە پەنهان "غەیب" هەیە ونوێژەکانیان ئەنجام دەدەن بەو شێوەیەی فەرمانیان پێکراوە ، وهەندێك لەو سامانەی کە پێمان بەخشیون دەیبەخشن وزەکات دەردەکەن ، وئەو خەرجیانەشی لەسەریان پێویستە بەجێی دەهێنن .

﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ۝٤﴾ وئەوانەشی کە باوەڕ دەهێنن بەوەی بۆمان دابەزاندوی کە قورئانە ، وهەروەها باوەڕدەهێنن بەو کتێبانەی کە پێش تۆ دابەزیون ، ودڵنیان لەوەی ڕۆژی قیامەت دێت .

زانایان دەڵێن : لە ڕاستیدا سوننەتەکانی پێغەمبەری خوداش ﷺ بە وەحی دابەزێنراوە ، چونکە خودای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝٤﴾(النَّجۡمِ) ئەوەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ بە سەرتاندا دەخوێنێتەوە یان پێتان ڕادەگەیەنێت لە قورئان یان لە سوننەت لە حەز وئارەزووەوە نییە ، بەڵکو بە دڵنیاییەوە ئەوە سروشە(وحی) بۆی هاتووە ، ئەبوداود لە عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی العاصەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، کاتێك پرسیاری لە پێغەمبەری خودا ﷺ کردووە : ئایا هەموو ئەو قسانەی دەیکات بینووسیتەوە لە کاتی توڕەبوون وکاتێکیش کە ئاساییە ؟! فەرمووی : بینووسە سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە لە زارمەوە دەرناچێت ڕاستی نەبێت .

﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ۝٥﴾ ئەو کەسانەی باوەڕیان بەو شێوەیە ئەوانە لەسەر هیدایەت وڕێنمایی وڕووناکی پەروەردگاریانن ، وئەوانەن براوە وسەرفراز لە دونیا ودواڕۆژدا .

لە دونیادا بە ئارامی دەژین بە هۆکاری ئەو باوەڕەی کە هەیانە ، ولە دوارۆژیش پارێزراو دەبن لە ئاگری دۆزەخ وبەهەشتی نەبڕاوەی هەتا هەتایی بەدەست دەهێنن .

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٦﴾ بە دڵنیاییەوە ئەو کەسانەی کە بێباوەڕن ئاگاداریان بکەیتەوە وبیانترسێنیت یان ئاگاداریان نەکەیتەوە وەك یەکە وسودی نییە باوەڕناهێنن.

البغوی دەڵێت : بێباوەڕی چوار جۆرە : بێباوەڕی نکولیکردن ، دانپێدانەنان ، کەللە ڕەقی ، دووڕوویی ، بێباوەڕی نکولیکار وەك : ئەو کەسەی کە باوەڕی بە بوونی پەروەردگاری دروستکەر نەبێت ، بێباوەڕی دانپێدانەنان وەك : بێباوەڕی ئیبلیس وجوولەکەکان کە لە دڵەوە باوەڕیان هەیە بەڵام دانی پێدانانێن ، بێباوەڕی کەللە ڕەقی وەك : ئەبوطالبی مامی پێغەمبەری خودا ﷺ کە لە دڵەوە باوەڕی بە خودا هەبوو ، وبەزمانیش دانیپێدادەنا ، بەڵام کرداری پێنەکرد وموسڵمان نەبوو ، وبێباوەڕی دووڕوو : کەسێکە کە بە زمان بڵێت باوەڕم هێناوە ، بەڵام لە دڵەوە باوەڕی نەبێت ، پێچەوانەی جۆری دووەم ، ئیبن ئەبوحاتم والطبری لە ئیبن عەباس رضي الله عنهما دەگێڕنەوە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ سوربوو لەسەر ئەوەی هەموو خەڵك

الجُزْءُ الأَوَّلُ سُورَةُ البَقَرَةِ

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٦ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ۝٧ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ۝٨ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ۝٩ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ۝١٠ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ۝١١ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ۝١٢ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُۗ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ ۝١٣ وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ۝١٤ ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ۝١٥ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ۝١٦

٣

باوەڕ بهێنن وشوێنی بکەون بۆ ڕێگای هیدایەت ، خودای پەروەردگار هەواڵی دابە پێغەمبەر ﷺ باوەڕ ناهێنێت هەرکەسێ پێشتر لە قەدەریدا سەرفراز وبەختەوەری نەنوسرابێت .

﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٧﴾ ئەو کەسانە خودا مۆریداوە بەسەر دڵ وگوێیاندا نەحەق دەچێتە دڵیانەوە ونە حەق دەبیستن ، وپەردەی هێناوە بەسەر چاویاندا حەق نابینن ، ئەو جۆرە کەسانە سزای گەورەیان بۆ دانراوە .

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨﴾ هەندێك لە خەڵك دەڵێن باوەڕمان بە خودا وڕۆژی دوایی هێناوە بەڵام ئەو کەسانە دووڕوون ، ڕاست ناکەن باوەڕدارنین .

﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ ئەو دووڕووانە لەپای نەفامی وبێباوەڕییان گومانیان وابوو بەو شێوەیە دەتوانن فێڵ لە خودای پەروەردگار وباوڕداران بکەن ، بەڵام لە ڕاستیدا فێڵ لە خۆیان دەکەن لە کاتێکدا کە هەست بەوەناکەن .

﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ١٠﴾ لە دڵیاندا نەخۆشی هەیە کە لێرەدا مەبەست : لە نەخۆشی گومان ، دوو دڵی ، ودووڕوویییە ؛ خودای پەروەردگار ئەو نەخۆشیەی بۆ زیاتر کردن لە پاداشتی ئەو فێڵ وخراپەکارییەیان ئەمە لە دونیا ، ولە دوا ڕۆژیش سزایەکی بە ئازاریان بۆ هەیە لەبەر ئەوەی درۆیانکرد .

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١﴾ ئەگەر بەو دووڕووانە بگوترایە خراپە وتاوان ئەنجام مەدەن ، بێباوەڕی لەسەر زەوی بڵاومەکەنەوە ، بە درۆوە دەیانگوت ئێمە تەنها چاکە وچاکەخوازیمان مەبەستە .

﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ١٢﴾ خودای پەروەردگار بەرپەرچی ئەو بانگەشەیەی دانەوە کە بە چاکەکاری وویستی بڵاوکردنەوەی چاکە وێنایان دەکرد ، وپێی فەرموون : بە دڵنیاییەوە ئەوانە خراپەکار وتێکدەرن ورۆچووی تاوان وتێوەگلاوی ئاشوب وخراپەکارین ، بەڵام لەبەر ئەوەی نەفام ونەزانن هەست ناکەن .

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُۗ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ ١٣﴾ ئەگەر پێیان بگوترایە باوەڕبهێنن وەك چۆن هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ باوەڕیان هێناوە ، دەیانگوت : باوەڕبهێنین وەك چۆن ئەو گەمژە وگێلانە باوەڕیان هێناوە ، بەدڵنیاییەوە تەنها خۆیان گەمژە وگێلن ، بەڵام بێئاگا ونەزانن .

ناسینی ڕاستی بە ڕاستی وپووچەڵ ونارەوا وەکو خۆی نیعمەتێکە خودا ﷻ بە دووڕوو ولارێکانی نەبەخشیوە ، پەنا بە خودا بەو هۆیەوە تێکەڵییەك لای خاوەنەکانی دروست دەبێت ، ناتوانن حەق وڕاستی لە پووچەڵ ونارەوا جیابکەنەوە .

﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤﴾ ئەو دووڕووانە ئەگەر بگەیشتبان بە باوەڕداران دەیانگوت : ئێمەش باوەڕمان هێناوە ، وکاتێك دوور بکەوتنایەتەوە وبچوونایە بۆ لای شەیتانەکانیان کە گەورە ودەم ڕاستیان بوون دەیانگوت : ئێمە لەگەڵ ئێوەین بەڵکو ئێمە تەنها گاڵتە وگاڵتەیان پێکردن .

﴿ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾﴾ لە سزای ئەو گاڵتەجارییەیان خودای پەروەردگار گاڵتەی بەوان کرد ولەسەرکەشی ، وتاوان ، وبێباوەڕی زیاتر نغرۆیکردن وکوێریکردن لە ئاستی بینینی ڕاستی ؛ لەبەر ئەوە بە دڵە ڕاوکێ وشپرزەیی مانەوە ، کە بەهیچ شێوەیەك ناتوانن ڕێگە چارەیەك بدۆزنەوە بۆ دەرچوون لەو گێژاوەی کە تێیکەوتوون .

﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمْ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٦﴾﴾ ئەو دووڕووانە بە ویست وئارەزووی خۆیان گومراییان هەڵبژارد وپشتیان لە هیدایەت وباوەڕکرد ، وگۆڕییانەوە بە بێباوەڕی ، لەو گۆڕینەوەدا سوود وقازانجیان نەکرد ، وهیدایەت وبەرچاوڕوونیان بە دەست نەهێنا ، هەربۆیە لە ڕیزی ڕێنمایی کراواندانین .

چۆن کڕیارێك ویستی کڕینی کاڵایەکی بە نرخ وناوازەی هەبێت وحەز بکات بیکڕێت بە هەر نرخێك بێت ، بەو شێوەیە ئەو دووڕووانەش ئارەزوو وحەزیان لە هەڵبژاردنی گومرایی وبێباوەڕییە ولەو پێناوەشدا ئامادەن بە نرخترین شت کە باوەڕ وهیدایەتە بیکەن بە قوربانی ، کە بەڕاستی ئەوە دۆڕاوترین گرێبەستە .

الجُزْءُ الأَوَّلُ　　سُورَةُ البَقَرَةِ

مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ
ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ﴿١٧﴾ صُمٌّۢ
بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ
ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ
ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ
يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ
قَامُوا۟ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ
كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى
خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ
ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ
بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ
تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا۟
بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن
كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ وَلَن تَفْعَلُوا۟ فَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ
ٱلَّتِى وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾

٤

﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ١٧﴾ نموونەی ئەوانە وەك : نموونەی ئەو كەسەیە كە ئاگرێك بكاتەوە ، یان داوا لە كەسێكی تر بكات ئاگرێكی بۆ بكاتەوە كاتێك چواردەوری ڕووناك دەبێتەوە خودای پەروەردگار ڕووناكییەكەی لێ كوژاندنەوە ، ولە تاریكییەكاندا هێشتنییەوە ئیدی هیچیان بەدی نەدەكرد .

﴿صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨﴾ ئەوان كەڕن لە ئاست بیستنی حەق ، لاڵن بۆ وتنی حەق ، كوێرن لە ئاست بینینی دا ، لەبەر ئەوە بەهیچ شێوەیەك لەو گومڕاییەی تێیكەوتوون ناگەڕێنەوە وپەشیمان نابنەوە .

﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٞ وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ یان وەك ئەو بارانەی لە شەوە زەنگی ئاسماندا بە خوڕ دێتە خوارەوە ، تاریكی وهەورەگرمە وبروسكەی هەوری لەگەڵدابێت ، لەو ساتەوەختەدا پەنجەكانیان لە گوێكانیان دەئاخنن لە ترسی ئەوەی نەوەكو هەورە گرمە وبروسكەی هەورەكە لەناویان ببات ، خودای پەروەردگار لە هەموو لایەكەوە دەورەی بێباوەڕەكانیداوە ، ولە تۆڵە وسزای خودا دەربازیان نابێت .

﴿يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ قَامُواْۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٠﴾ نزیكە بروسكەی هەورەكە كوێریان بكات وچاوەكانیان لێ بسێنێتەوە ، هەركات بەرچاویان ڕووناك دەبوویەوە هەندێك دەڕۆیشتن ، بەڵام كە ڕووناكیەكە خامۆش دەبوو دەوەستان ، ئەگەر خودا بیویستبایە بیستن وبینینی لێ دەسەندنەوە ، بە دڵنیاییەوە خودا جل جلاله توانای بەسەر هەموو شتێكدا هەیە .

ئەم نمونانە خودای پەروەردگار باسی کردوون گوزارشت لە حاڵی دوورِووەکان دەکات ، کە هەندێکیان لە سەرەتاوە باوەڕیان هێنا بەوەش ڕووناکی باوەڕیان بەدەستهێنا ، بەڵام کە بێباوەڕبوون ئەو ڕووناکیەیان لێ کوژایەوە ، بەو هۆیەوە زیاتر دوودڵبوون ولە ڕێگای ڕاست زیاتر دووركەوتنەوە ، ئیدی بە هیچ شێوەیەك ئومێدی چاکەیان لێناکرێت ، هەروەك چۆن کەسێك کەڕ ولاڵ وکوێربێت هیچ ئومێدێك نییە بۆ بیستن وقسەکردن وبینینی ، بە هەمان شێوەش هیچ ئومێدێك لە مەڕ باوەڕهێنانی دوورِووەکان بوونی نییە ؛ ئەوە لە کاتێکدا ڕووناکی حەق ئەوەندە بەهێزە واخەریکە کوێریان بکات ، هەرکات ئیسلام باڵادەست بوو ، یان هەندێکیان ڕاستی ئیسلامی بۆ دەرکەوت باوەڕدەهێنن ، بەڵام ئەگەر ئەو ڕاستییەی کە ڕوون بووەتەوە ماوەیەکی بەسەردابچێت یان تووشی نەهامەتی وناڕەحەتیەك ببن لەسەر ئیسلامەتی وئاینداریيەکەیان پاشگەز دەبنەوە وبێباوەڕدەبن .

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٢١﴾ خودای باڵادەست دوای ئەوەی باسی حاڵی هەموو مرۆڤەکانی کرد بە باوەڕدار وبێباوەڕ ودوورِوویانەوە پێیان دەفەرموێت : ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان بپەرستن کە ئێوە ونەوەکانی پێش ئێوەشی دروستکردووە بۆ ئەوەی پارێزکاربن وسنورەکانی خودا نەبەزێنن .

سورەتی البقرە هەرچەندە سورەتێکە لە مەدینە دابەزیوە وزۆرجار بانگەوازی سورەتە مەدەنیەکان ڕووی لە باوەڕدارانە بەڵام لێرە بانگەوازەکە گشتییە وبۆ هەموو خەڵکە .

﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقًا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٢٢﴾ ئەو خودایەی کە زەوی وەك ڕاخەرێك بۆ ڕاخستوون وئاسمانی کردووە بە سەقف بە سەرتانەوە ، ولە ئاسمانەوە بارانتان بۆ

دەبارێنێت كە بە هۆیەوە بەروبوومەكانتان بۆ دەڕوێنێت ودەیكات بە ڕۆزیتان ، كەوابوو ئەو پەروەردگارە كە خاوەنی ئەو هەموو نازونیعمەتانەیە بەسەرتانەوە بە تەنهایی بیپەرستن وهاوبەشی بۆ بڕیار مەدەن ، لە كاتێكدا دەزانن خودا تاك وتەنهایە وبەدیهێنەری ئەو نیعمەتانەیە .

بوخاری لە ئیبن مسعودەوە ﷺ ڕیوایەتی كردووە دەڵێت : پرسیاركرا لە پێغەمبەری خودا ﷺ چ تاوانێك لە هەموو تاوانەكان گەورەترە فەرمووی : هاوبەش بڕیار بدەیت بۆ ئەو خودایەی كە دروستی كردوویت .

﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾﴾ جا ئەگەر گومانتان هەیە لەو قورئانەی كە بۆ بەندە وپێغەمبەرەكەمان محمد ﷺ دامانبەزاندوە دەی بفەرموون سورەتێكی هاوشێوەی ئەوە بهێنن وپشت ببەستن بە پەرستراوەكانتان ، وبانگی خەڵكیش بكەن یارمەتیتان بدەن ، جگە لە خودای پەروەردگار ، ئەگەر ڕاست دەكەن ئەو قورئانە محمد ﷺ لە خۆیەوە هێناویەتی سروش وفەرموودەی ئێمە نییە .

﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾﴾ گەر لە ڕابردوو نەتانتوانی ولە داهاتووش هەرگیز ناتوانن هاوشێوەی سورەتێكی قورئان بهێنن ، چونكە قورئان قسەی مرۆڤەكان نییە كە وابوو باوەڕبهێنن وخۆتان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخ كە سوتەمەنیەكەی لاشەی خەڵك وبەردە ، ساز وئامادەكراوە بۆ بێباوەڕان .

ئیبن عەباس رضي الله عنهما دەڵێت : ئەو بەردانە بەردی کبریتە ، لەبەر ئەوەی بەخێرایی بڵێسە دەسێنێت وگڕ وکڵپەی زۆرە وبۆنێکی ناخۆشی هەیە ، ئامادەکراوە بۆ بێباوەڕان ، زۆرێك لە پێشەواکانی سوننەت ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئاگری دۆزەخ ئێستا ئامادەیە ودروستکراوە ، بەڵگەی زۆریش لە سوننەتدا لەسەر ئەو باسە هاتووە .

الجزء الأول		سورة البقرة



وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٖ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٖ رِّزْقٗا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗاۖ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾ ۞إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلٗا مَّا بَعُوضَةٗ فَمَا فَوْقَهَاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرٗا وَيَهْدِي بِهِۦ كَثِيرٗاۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتٗا فَأَحْيَٰكُمْۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعٗا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٖۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٩﴾

٥

﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٖ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٖ رِّزْقٗا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗاۖ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾﴾ ومژدە بدە بەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە وکردەوەی باش ئەنجام دەدەن ، بەوەی لە بەهەشتدا باخی چڕوپڕیان بۆ هەیە کە ئاو بە ژێر دار ودرەخت وخانووەکانیدا دەڕوات ، هەرکاتێك خودای پەروەردگار ڕۆزییان بدات لە میوە وبەروبوومێك دەڵێن : ئەمەمان پێشتر پێ بەخشراوە ، میوە وبەروبوومی هاوشێوەی یەکیان بۆ دەهێنن ، بەڵام تامیان جیاوازە ولە یەك ناچن ، ولە بەهەشتدا خێزانی پاکیان بۆ هەیە ، وبە هەتا هەتایی تێیدا دەمێننەوە .

کردەوە دەبێت بە نیازپاکی بۆ خودا ولەسەر سوننەتی پێغەمبەری خودا بێت ﷺ ئینجا پێی دەگوترێت کردەوەی باش وقەبوڵکراو ، وئەو میوە وبەروبوومانەی پێیان دەبەخشرێت وتراوە : ناویان لە ناوی میوەکانی دونیا دەچێت ، بەڵام تامیان جیاوازە ، یان لە بە هەشتدا هەرکات خودای پەروەردگار ڕۆزیان دەدات بە شێوە وڕواڵەت لەوانەی پێشووی دەچێت بەڵام تام ولەزەتی جیاوازترە ، وخودای پەروەردگار بە ڕەهایی وەسفی پاکێتی خێزانی بەهەشتییەکان دەکات ، بۆ ئەوەی هەموو جۆرە پاکێتییەك بگرێتەوە ، نەك پاکێتی تەنها لە حەیز وسوڕی مانگانە بەڵکو لە خووڕەوشت وزمان و هەموو کەموکورتییەکانی تر .

﴿۞إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾﴾ بە دڵنیاییەوە خودای پەروەردگار شەرم ناکات نموونە بە مێشولە گەورەتر یان بچوکتر بهێنێتەوە ، ئەوانەی باوەڕیان هێناوە دەزانن ئەوە حەق وڕاستیە لە لایەن پەروەردگاریانەوە ، بەڵام ئەوانەی بێباوەڕن دەڵێن : خودا چی دەوێت لەوەی کە نموونە بە مێشولە بهێنێتەوە ، بێباوەڕ ودووڕووەکان بە هۆیەوە زیاتر گومڕادەبن ، وباوەڕدارانیش زیاتر ڕێنمایی وهیدایەت وەردەگرن ، کەس گومڕا نابێت بەم نموونە هێنانەوەیە کەسانی لادەر ولە سنور دەرچوونەبێت .

السدی دەڵێت : ئیبن عەباس وئیبن مسعود رضي الله عنهما وهەندێکی تر لە هاوەڵان دەڵێن : کاتێك خودای پەروەردگار ئەو دوو نموونەیەیی پێشوی باسکرد لەسەر دووڕووەکان ، وتیان : خودا لەوە بەرزتر وگەورەترە کە نموونە بهێنێتەوە خودای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند ؛ وقتادە دەڵێت : کاتێك خودای پەروەردگار باسی مێش وجاڵجاڵۆکەی کرد لە قورئاندا هاوبەش

بڕیاردەرەکان وتیان : چۆن دەبێت باسی مێش وجاڵجاڵۆکە بکرێت لـە قورئاندا ؟! خودای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند .

﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾﴾ ئەو کەسانەی پەیمان شکێنن ئەو بەڵێن وپەیمانەی بەخودایان داوە هەڵی دەوەشێننەوە ونایبەنەسەر ، کە بریتی بوو لـە باوەڕهێنان بە خودا وبە پێغەمبەرەکانی ، وسیلـەی ڕەحم دەپچڕێنن کە خودا فەرمانی بە گەیاندنی کردووە ، وبشێوی دەنێنەوە ، وخراپەکاری لـەسەر زەوی ئەنجام دەدەن ، ئەوانە دۆڕاو وزەرەرمەندن بە هەموو شێوەیەك .

ئەو پەیمانە کە خودای پەروەردگار باسی دەکات هەموو ئەو پەیمانانە دەگرێتەوە کە خودا لـە بەندەکانی وەرگرتووە ، کە بە تاك وتەنهایی بیپەرستن وهیچ هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن ، وهەموو ئەو پەیمانانەش دەگرێتەوە کە مرۆڤەکان لـە نێوانیان هەیە پێویستە پێوەی پابەندبن وهەڵی نەوەشێننەوە ، بۆیە دەبێت باوەڕداران دووربن لـە شکاندنی ئەو بەڵێن وپەیمانانەی بە خودا وبەندەکانی خودایان داوە بە هەموو شێوەیەك ، بۆ ئەوەی لـەو کەسە ڕەنجەڕۆ وزەرەرمەندانە نەبن .

﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾﴾ ئەمە پرسیارێکی سەرزەنشت ئامێز وسەرسوڕهێنەرە چۆن نکولی بوونی خودا دەکەن ؟! ، یان لـەگەڵ خودادا کەسی تر دەپەرستن ؟! لـە کاتێکدا ئێوە بوونتان نەبوو ، وتۆوێك بوون لـە پشتی باوکتانەوە ، ئێوەی هێنایەبوون ، پاشان دەتانمرێنێت ، وپاشان زیندووتان دەکاتەوە ،

وپاشان بۆ لای پەروەردگارتان دەگەڕێنەوە ولێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات لەسەر کردەوەکانتان .

﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ٢٩﴾ خودایە کە هەموو ئەوەی لە زەویدایە بۆی دروستکردوون ، بۆ ئەوەی سوود وپەندیان لێوەربگرن ، پاشان ویستی دروستکردنی ئاسمانەکانی کرد وبە حەوت ئاسمان بە جوانی وڕێکوپێکی دروستی کردن ، خودا بە هەموو شتێك زانایە .

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە خودای پەروەردگار زەوی پێش ئاسمان دروستکردووە ، وبەڵگەشە بۆ ئەو ڕێسا فقهیەی کە دەڵێت : (الأصل في الأشياء الإباحة) ، واتە : لە بنەڕەتدا شتەکان حەڵاڵن ، چونکە خودای پەروەردگار مننەت دەکات بەسەر بەندەکانیدا کە هەموو ئەوەی لەسەر زەویە بۆ خزمەت وبەرژەوەندی مرۆڤەکان دروستی کردووە ، السعدی دەڵێت : (استوى) لە قورئاندا بە سێ شێوە هاتووە : ئەگەر بە پیتی جەڕ تێپەڕنەکرا : بە مانای پێگەیشتن وکامڵ بوونە ، وەك دەفەرموێت : ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسۡتَوَىٰٓ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ ١٤﴾(القَصَص) ، وبە مانای بەرزی وبڵندبوون دێت ئەگەر بەپیتی جەڕی (على)تێپەڕکرا ، وەك دەفەرموێت :﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ٥﴾(طه) ، وئەگەر بەپیتی جەڕی (إلى) تێپەڕکرا بە مانای ویست دێت ، وەك لەم ئایەتەدا هاتووە : ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖۚ﴾ .

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو : من جێنشینێك لـەسەر زەوی دادەنێم ، وتیان : لـەسەر زەوی جێنشین دادەنێیت ؟! کە خراپەکاری وتاوان ئەنجامبدەن وخوێن بڕێژن ؟! ئێمە بە پاك وپیرۆزت ڕادەگرین وستایشت دەکەین ، یان بە پاکی پەرستشت دەکەین ، کە بە دووربێت لـە هەموو هاوبەش بڕیاردان وخراپەیەك ، فەرمووی ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن .

الجُزْءُ الأَوَّلُ — سُورَةُ البَقَرَةِ

وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّيٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾

٦

زانایان ناکۆکن مەبەست لـە جێنشین چییە : هەندێك دەڵێن مەبەست لـەوەیە مرۆڤەکان دەبنەجێنشینی یەکتر ، ونەوە دوای نەوە جێگەی یەکتر دەگرنەوە ، وهەندێك دەڵێن : مەبەست پێی مرۆڤەکانە دەبنە جێنشین لـەسەر زەوی وپەیام وشەریعەت وفەرمان ویاساغییەکانی خودا ﷻ بە خەڵك ڕادەگەیەنن ، وهەندێك دەڵێن : مەبەست پێی ئادەمە ﷺ چونکە پێش مرۆڤ جن لـەسەر زەوی بوون ومرۆڤ بووە جێنشینیان ، لـێرە خودای پەروەردگار دەفەرموویێت : لـەسەر زەوی جێنشین دادەنێم بەڵام ئادەم وحەوای لـە بەهەشتدا دروستکرد ، گومان لـەوەدا نییە کە خودا زانایە ، ودەزانێت ئادەم وحەوا بە هەڵبژاردنی خۆیان بە قسەی شەیتان دەکەن ، ولـەو

درەختە دەخۆن كە فەرمانیان پێكرابوو لێی دوور بكەونەوە ، كە ئەوەش هۆكاری دەركردن ودابەزاندنیان بوو لە بەهەشت چونكە خودا ﷻ پێشتر ئادەم وحەوای لەوە ئاگادار كردبوویەوە پێی وفەرمووبوون : ﴿فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴿١١٧﴾﴾(طه) ، وئەو بەهەشتەی كە ئادەم وحەوای لێدەركرا هەمان ئەو بەهەشتەیە كە ئامادەكراوە بۆ باوەڕداران ، هەركەس پێچەوانەی ئەم بۆچوونەبێت دەبێت بەڵگەی دروست بخاتە ڕوو .

فریشتەكان مەبەستیان نكولی نەبوو بەڵكو پرسیاریانكرد بۆ ئەوەی بزانن ، ئایا فریشتەكان چۆن زانیان مرۆڤەكان خراپەكاری دەكەن وخوێن دەڕێژن ؟ ، دەشێت خودای پەروەردگار ئەوەی پێ ڕاگەیاندبن كە هەندێك لە نەوەكانی ئادەم ﷺ ئەو خراپەكارییانە ئەنجام دەدەن ، یان بە گومان ئەوەیان وتووە ، یان جنەكان كە پێش مرۆڤەكان لەسەر زەوی بوون ئەو خراپەكاریانەیان ئەنجامدابوو ، بۆیە فریشتەكان گومانیان وابوو مرۆڤەكانیش ئەو كردەوانە ئەنجام دەدەن ، وئەوەی كە فریشتەكان بە پەروەردگاریان فەرموو : لەسەر زەوی جێنشین دروست دەكەیت كە خراپەكاری وتاوان ئەنجامبدەن وخوێن بڕێژن ئەو بۆچوونە بەهێزدەكات كە لەسەر زەوی پێش ئادەم دروستكراوی تر هەبوویێت ، فریشتەكان دروستكراوێكی پەنهانی خودای پەروەردگارن ولە ڕووناكی دروست كراون ، وئەركی جیاواز ڕادەپەڕێنن ، وسەرپێچی خودا ﷻ ناكەن وباوەڕبوون بە فریشتەكان یەكێكە لە شەش پایەكەی باوەڕ .

﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾﴾ خودای پەروەردگار ناوی هەموو شتەكانی فێری ئادەم ﷺ كرد پاشان

پرسیاری ناوی ئەو شتانەی لـە فریشتەکان کرد وفەرمووی : هەواڵم بدەنێ دەربارەی ناوی ئەو شتانە ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن .

السعدی دەڵێت : لـەبەر ئەوەی وتەی فریشتەکان ئاماژەی ئەوەی تێدابوو کە لـە ئادەم باشترن ، خودا ویستی فەزڵی ئادەمیان بۆ دەربخات ، بەوەی ناوی ئەو شتانەی فێری ئادەم کرد وفریشتەکان نەیانزانی ، البغوی دەڵێت : خودای پەروەردگار فەزڵی ئادەمی دەرخست بەسەر فریشتەکانەوە بە زانست ، وبەڵگەی ئەوەشی تێدایە کە پێغەمبەران لـە فریشتە باشترن ، ئەوە بۆچوونی ئەهلی سوننەیە .

﴿قَالُوا۟ سُبْحَـٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾﴾ وتیان : پاك وبێگەردی بۆ پەروەردگارمان هیچ زانستمان نییە تەنها ئەوە نەبێت کە فێرت کردووین ، بە دڵنیاییەوە هەر تۆ زانا ودانا وکارلـەجێیت .

﴿قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾﴾ پەروەردگار فەرمووی : ئەی ئادەم هەواڵیان بدەرێ دەربارەی ناوی ئەو شتانە ، کاتێك ئادەم ناوی شتەکانی بە فریشتەکان وت ، فەرمووی : من پێم نەفەرموون ئەوەی زانستی پەنهانە لـە ئاسمانەکان وزەویدا دەیزانم ؟ ، وئەوەش دەزانم کە بە ئاشکرا دەریدەبڕن وئەنجامیدەدەن یان بە شاراوەیی ؟ .

ئیبن کثیر دەڵێت : ئەوەی بە ئاشکرا دەریانبڕی ئەو وتەیەیان بوو کە وتیان : لـەسەر زەوی جێنشین دادەنێیت کە خراپەکاری وتاوان ئەنجامبدەن ، وئەوەشی کە شاراوەبوو ئەوە بوو کە ئیبلیس لـە ناخیدا بڕیاری دابوو کە سەرپێچی فەرمانەکانی خودا بکات ولوت بەرزبێت وملکەچ نەبێت .

﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾ کاتێك بە فریشتەکانمان فەرموو سوژدە بەرن بۆ ئادەم ، هەموویان سوژدەیان برد ، ئیبلیس نەبێت ڕەتیکردەوە ولوتبەرزبوو ولە سەرپێچیکارە بێباوەڕەکان بوو .

خودای پەروەردگار بە شێوازی کۆ دەفەرموێت : بە فریشتەکانمان فەرموو ، مەبەست لەم شێوازە دەربڕینە بە گەورەدانانە ؛ وئەو سوژدە بردنەی فریشتەکان سوژدەی بەندایەتی کردن وپەرستن نەبوو ، بەڵکو سوژدەی ڕێز لێنان بوو لە ئادەم ﷺ ، مانای ناوی ئیبلیس واتە : بێ ئومێد ودوور لە سۆز وبەزەیی خودا ، وئیبلیس فریشتە نەبوو بەڵام کردەوەی لە ڕەواڵەتدا لە کردەوەی فریشتەکان دەچوو بۆیە لەگەڵ ئەوان باسکراوە ، وشایەنی باسە سوژدە بردن لە شەریعەتی ئیسلامدا بۆ جگە لە خودا حەرام وتاوانە ئەگەر بۆ پەرستنیش نەبێت ، وئەو حوکمە لە ئیسلامدا هەڵگیراوە .

﴿وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٣٥﴾ وبە ئادەممان فەرموو : خۆت وخێزانەکەت حەوا لە بەهەشتدا جێگیر ونیشتەجێبن هەرچ کات ولە هەرکوێ حەزتان لە هەرچیکرد بیخۆن وچێژببەن لە بەروبوومەکانی بەهەشت ، بە ئاسودەیی وخۆشگوزەرانی ، بەڵام نزیکی ئەم درەختە مەکەونەوە ، ئەگینا لە ستەمکاران دەبن .

بەڵگەی ڕاست ودروست لەبەردەستدا نییە ئەو درەختەی قەدەغەکراوە کە ئادەم وحەوا لێی نەخۆن چ درەخت وبەروبوومێك بووە ، وتراوە : تریێ یان گوڵە گەنم یان هەنجیر بووە ، قەدەغەکردنی خواردن لەو درەختە تاقیکردنەوە بوو بۆ ئادەم ﷺ ، بەڵام لە تاقیکردنەوەکە دەرنەچوو .

﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّۖ وَلَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ٣٦﴾ شەیتان بە هەڵەیدابردن وبووە هۆکاری ئەوەی لەو نازونیعمەتەی کە تێیدابوون دەریکردن ، پێمان فەرموون : دابەزنە سەر زەوی هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن ، ولەسەر زەوی جێگیر ونیشتەجێدەبن هەتا کۆتای هاتنی ژیانتان .

ئادەم وحەوا وئیبلیس لە بەهەشت دەرکران ، دوژمنایەتی شەیتان بۆ ئادەم لەو کاتەوە دەستیپێکرد کە ئێرەیی بە ئادەم ﷺ برد ، ولوت بەرزبوو وسوژدەی بۆ نەبرد ، شەیتان : واتە : دوور لە ڕەحم وبەزەیی خودا ، شەیتان هەندێك جار مەبەست پێی ئیبلیسە کە لە سەرەتادا لەگەڵ فریشتەکان بوو ، وهەندێك جار بە هەموو خراپەکار وبانگەوازکاران بۆ تاوان وسەرپێچی خودا لە مرۆڤ وجن بەکاردەهێنرێت ، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە بەهەشت لەبەرزییە ، چونکە دەفەرموێت پێمان فەرموون : دابەزنە سەر زەوی ، وئەوەش کە شەیتان دوژمنی سەرسەختی مرۆڤە ، وپێویستە مرۆڤیش بە دوژمنی بزانێت .

﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ٣٧﴾ ئادەم چەند وشەیەکی لە پەروەردگارییەوە وەرگرت وداوای لێخۆشبوونی پێکرد وخوداش لێی خۆشبوو ، تەنها خودایە تەوبەی بەندەکانی قەبوڵدەکات وبە بەزەییە .

ئەو وشانەی کە ئادەم وحەوا لە پەروەردگاریانەوە وەریانگرت لەو ئایەتەدا هاتوو : ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ٢٣﴾(الأَعْرَافِ) ، ئادەم وحەوا فەرموویان : پەروەردگارا ئێمە ستەممان لە نەفسی خۆمان کرد ئەگەر لێمان خۆش نەبیت وڕەحمان پێنەکەیت بە دڵنیاییەوە لە زەرەرمەندان دەبین .

﴿قُلْنَا ٱهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعًاۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾﴾ پێمان فەرموون هەمووتان دابەزنە سەر زەوی ، کاتێك لە لایەن منەوە هیدایەت ورێنماییتان بۆ هات ، هەرکەس شوێن هیدایەتی من بکەوێت وباوەڕی پێبهێنێت ترسی لەسەر نییە لەوەی کە لە دوارۆژدا ڕوو دەدات ، وخەفەت ناخۆن بۆ ئەوەی لە دونیا لە دەستیان دەردەچێت .

ئەم دووبارە فەرمانکردنە بە دابەزین بۆ سەر زەوی بۆ جەختکردنەوەیە لە یەکەم فەرمان بە دابەزین .



﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾﴾ وئەوانەی بێباوەڕن وئایەتەکانمان بە درۆدەزانن ، ئەوانە هاوەڵی ئاگرن ، وبە هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە .

﴿يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِيٓ أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّٰيَ فَٱرْهَبُونِ ﴿٤٠﴾﴾ ئەی نەوەکانی یەعقوب ئەو نیعمەتانەی من بە یاد بهێننەوە کە پێم بەخشیبوون ، ووەفاداربن بەو پەیمانەی بەمنتانداوە منیش وەفاداردەبم بەو پەیمانەی پێمداون ، وبە تەنها لە من بترسن .

ئیسرائیل نازناوی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە ﷺ ، وتراوە مانای بەندەی خودایە ، مەبەست لە نەوەکانی بریتییە لە : پێغەمبەرانی نەوەکانی ئیسرائیل ، وجوولەکە وگاورەکان ، بەڵام لێرە مەبەست لەو سێ هۆزە جوولەکەیە کە لە مەدینە نیشتەجێبوون : (بنو قینقاع ، بنو النضیر ، بنو قریظە) ، کە چاوەڕوانی هاتنی کۆتا پێغەمبەریان دەکرد ، بەڵام کاتێك خودای پەروەردگار پێغەمبەری ئیسلامی ڕەوانەکرد ، ولە نەوەکانی یەعقوب نەبوو باوەڕیان پێنەهێنا ونکولیانکرد ، نیعمەتەکانی خودا بە ڕەهایی هاتووە بۆ ئەوەی هەموو نیعمەتەکانی خودا بگرێتەوە ، کە بەسەر نەوەکانی یەعقوبدا ڕشتبووی لە پێغەمبەرایەتی ورزگارکردنیان لە دەستی فیرعەون ، وهەڵبژاردنیان وڕێزلێگرتنیان ، وئەو بەڵێنەش بە خودایاندابوو ، ئەوە بوو باوەڕ بە خودا وپێغەمبەرەکانی بهێنن وشوێنیان بکەون ، وبەڵێنی خوداش بۆ ئەوانە گەر ئەوان وەفاداربن پاداشت دانەوەیانە بە بەهەشت .

﴿وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۢ بِهِۦۖ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗا وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ ۝٤١﴾ وباوەڕبهێنن بەوەی دامبەزاندووە کە قورئانە وپشتڕاستیکردووەتەوە ئەوەی لە کتێبەکانی ئێوەدا هاتووە کە تەورات وئینجیلە ، ومەبنە یەکەم کۆمەڵ لە نەوەکانی یەعقوب کە باوەڕ بە قورئان نەهێنن ، بە ئایەتەکانم شتێکی کەم لە دونیا مەکڕن ، وەك پلە وپایە وناوبانگ وپارە ، وبە تەنها لە من بترسن .

لێرەدا خودای پەروەردگار سەرزەنشتی نەوەکانی یەعقوب دەکات بەوەی لە کاتێکدا خودا ﷻ نیعمەتی زۆری پێداون وپێغەمبەرانی لێ هەڵبژاردوون وزانستی پێبەخشیوون ، دەبوو پێش هەمووان ئەوان باوەڕ بە محمدی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ بهێنن ، بەڵام تەواو بە پێچەوانەوە نەك باوەڕیان نەهێنا ، بەڵکو نکولیانکرد وکەوتنە پیلان بۆ دارشتن ودژایەتیکردنی .

﴿وَلَا تَلۡبِسُواْ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُواْ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ۝٤٢﴾ ڕاستی تێكەڵ مەكەن لەگەڵ پووچەڵ ونارەوایی وڕاستی مەشارنەوە لە كاتێكدا دەزانن كە محمد ﷺ پێغەمبەر ونێردراوی خودایە .

جوولەكە گومانیان بۆ خەڵك دروست دەكرد بۆ نموونە دەیانگوت : ڕاستە محمد پێغەمبەرە بەڵام تەنها بۆ نەخوێندەوارەكان وعەرەب هاتووە بۆ هەمووان نییە ، خودای پەروەردگار یاساغی ئەو كارەی لێكردن ، ئەم ئایەتە سەرنجی موسڵمانان بۆ ئەوە ڕادەكێشێت كە دەبێت ڕوون وڕاشكاوبن وقسە وهەڵوێستەكانیان ڕوون وڕاشكاوبێت وقسەیەك نەكەن یان هەڵوێستێك نەنوێنن كە چەند ئەگەر ولێكدانەوە وتەفسیرێك هەڵبگرێت .

﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ۝٤٣﴾ ونوێژەكانتان بەو شێوەیەی كە فەرمانتان پێكراوە ئەنجامبدەن ، وزەكاتی سامانەكانتان دەربكەن ولەگەڵ كڕنووشبەران كڕنووشبەرن .

ئەم ئایەتە هەندێك لە زانایان كردوویانەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەنجامدانی نوێژە فەرزەكان بە كۆمەڵ "جەماعەت" لەگەڵ موسڵمانان واجبە ، وئیبن عثیمین دەڵێت : كردنە بەڵگەی ئەم ئایەتە لەسەر واجب بوونی ئەنجامدانی نوێژ بە كۆمەڵ جێی سەرنج وتێڕامانە ، چونكە فەرمانكردن بە لەگەڵبوون مانای ئەنجامدانی كردەوەكە نییە لەگەڵیان ، چونكە فەرمانكراوە بە مەریەم : ﴿يَٰمَرۡيَمُ ٱقۡنُتِي لِرَبِّكِ وَٱسۡجُدِي وَٱرۡكَعِي مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ۝٤٣﴾(آلِ عِمۡرَانَ) ، لەگەڵ كڕنووشبەران كڕنووشبەرێت ؛ زانراویشە كە نوێژی بە كۆمەڵ لەسەر ئافرەتان واجب نییە ، بەڵام واجبێتی نوێژی بە كۆمەڵ بەڵگەی زۆری لە سوننەتدا لەسەر هاتووە.

﴿۞أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾﴾ چۆن فەرمان بە خەڵك دەكەن بە ئەنجامدانی هەموو جۆرە چاكەیەك ونەفسی خۆتان فەرامۆشدەكەن ، لە كاتێكدا ئێوە كتێبەكەتان دەخوێننەوە كە تەوراتە وئەو چاكەی بۆ خەڵكی باس دەكەن لە تەوراتەوە فێریبوون ، ئایا ئێوە عەقڵتان نییە كە هەست بەو گومڕایی وهەڵەیەی خۆتان بكەن ؟!.

خودای پەروەردگار سەرزەنشتی نەكردن لەبەر ئەوەی فەرمان بە چاكە دەكەن بەڵكو لەبەر ئەوەی ئەو چاكەی فەرمانیان پێدەكرد خۆیان كردەوەیان پێنەدەكرد ، ویان بە پێچەوانەوە كردەوەیان دەكرد ، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە : ئایا ئەو كەسەی فەرمان بە چاكە دەكات وياساغی خراپە دەكات مەرجە پارێزراوبێت لە تاوان ؟ ، نەخێر مەرج نییە چونكە ئەو كەسانەی كە پارێزراون لە تاوان تەنها پێغەمبەرانن ، بەڵكو دەبێت فەرمان بە چاكە بكەیت وهەوڵبدەی خۆت ئەنجامی بدەیت ، وياساغی خراپە بكەیت وهەوڵبدەیت لێی بە دووربیت ، ئەو كەسانەی كە فەرمان بە چاكە دەكەن بەتایبەت ئەوانەی كە دەزانن ئەگەر خۆیان كردەوەی پێنەكەن ، یان پێچەوانەی ئەوە كردەوە بكەن كە بۆ خەڵكی باس دەكەن ، لەو سیفەتەدا لێكچوونیان هەیە لەگەڵ جوولەكەكان .

﴿وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾﴾ پشت ببەستن بە ئارامگرتن ونوێژ ، چونكە بە ڕاستی نوێژ قورس وگرانە ، لەسەر ئەو كەسانە نەبێت كە ملكەچی فەرمانی خودان .

ئیبن عثیمین دەڵێت : ئەم ئایەتە سودی ئەوەی لێدەكرێت كە دروستە داوای یارمەتی لە جگە لە خودا بكرێت بە شتێك دەتوانێت یارمەتیت بدات ، بۆ نموونە : ئەگەر داوای یارمەتی لە كەسێك بكەیت كە یارمەتیت بدات وشتومەكت لەگەڵدا هەڵبگرێت بۆ ماڵەوە دروستە ، بەڵام داوای

یارمەتی کردن بۆ شتێك کە نەتوانێت یارمەتیت بدات گەمژەیی وبێ عەقڵییە لە ئایندا ، وهەندێك جاریش دەبێتە هاوبەش بڕیاردان بۆ خودا ، وەك ئەوەی داوای یارمەتی لە مردوویەك بکەیت ، یان لەکەسێکی دوور کە نەتوانێت یارمەتیت بدات ، وئەم ئایەتە گەورەیی ئارامگرتن دەردەخات کە سێ جۆرە : ئارامگرتن لەسەر ئەنجامدانی فەرمانەکانی خودا ، وئارامگرتن لەسەر ئەنجامنەدانی تاوان وسەرپێچییەکان ، وئارامگرتن لەسەر قەدەرە ناخۆش وبەئازارەکان ؛ وهەروەها لەسەر گەورەیی نوێژ ، ئەبوداود لە حذیفەی کوڕی یەمانەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر کار وفەرمانێك دڵتەنگ وخەمباری کردبا نوێژی دەکرد ؛ والنسائی لە ئەنەسەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە حەسەنی داناوە ،کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : نوێژ جێگەی دڵخۆشیمە وگەورەترین چێژی لێدەبەم ؛ وئەبوداود لە پیاوێکی هۆزی خوزاعەوە ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو ﷺ بە بیلالی فەرموو : ئەی بیلال هەستە قامەت بکە بۆ ئەوەی نوێژ بکەین وئاسودەییمان پێ ببەخشێت .

﴿ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾﴾ ئەو کەسانە دڵنیان کە دەگەنە دیداری پەروەردگاریان وسەرەنجام بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە .

هەندێك لە زانایان ئەم ئایەتە دەکەنە یەکێك لەو بەڵگانەی کە باوەڕداران لە قیامەتدا خودای پەروەردگار دەبینن .

﴿يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾﴾
ئەی نەوەکانی یەعقوب هەموو ئەو نیعمەتانەی من بە یاد بهێننەوە کە پێم بەخشیبوون ، کە فەزڵ وڕێزی ئێوەم دابوو بەسەر هەموو خەڵکی سەردەمی خۆتاندا .

لەو نیعمەتە گەورانەی کە پێیان بەخشرابوو : هەڵبژاردنی پێغەمبەران ، ودابەزاندنی کتێب ، وبەخشینی تەختی پاشایەتی بوو بە هەندێکیان ، وئەم دووبارە بە یاد هێنانەوەیە بۆ زیاتر ئامۆژگاریکردن وسەرنج ڕاکێشانیان بوو .

﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا يُؤۡخَذُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾﴾ بترسن وخۆتان ئامادە بکەن بۆ ڕۆژێك کە کەس هیچ سودێك بە کەس ناگەیەنێت وتکا ونێوانگیری کەس قەبوڵ ناکرێت ، وهیچ شتێك لە بری بەخشینی کەس وەرناگیرێت ، وکەس ناتوانێت فریادڕەسیان بێت ورزگاریانبکات لە سزای خودا .

ئەو تکاکاریی ونێوان گیرییەی نەفیکراوە ئەو تکاکاری (شەفاعة) ونێوان گیرییانە ناگرێتەوە کە پێغەمبەران وپیاوچاکان دەیکەن بۆ هەرکەس کە خودا مۆڵەت وئیزنیان بدات وشایستەن تکایان بۆ بکرێت ، گومانی تێدا نییە لە دونیادا خەڵك دەتوانن بە پارە وسامان یان پلە وپایە وناوبانگ خۆیان دەرباز بکەن لەو سزایانەی کە پێویست دەبێت لەسەریان ، لەبەر ئەنجامدانی کردەوەی خراپ وسەرپێچی وبەزاندنی سنورەکان بەڵام لە قیامەتدا ئەوەی دەبێتە هۆکاری دەربازبوون وسەرفرازی تەنها ئەو کردەوە چاکانەیە کە باوەڕدار ئەنجامی دەدات .

﴿وَإِذۡ نَجَّيۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴿٤٩﴾﴾ وئەوەیان بەیاد بهێننەوە کە ڕزگارمان کردن لە فیرعەون ودارودەستەکەی ، کە قورسترین وخراپترین سزایان بە ئێوە دەچەشت ، کوڕەکانیان سەردەبڕین وکچەکانیان دەهێشتنەوە بۆ بەردەستی وخزمەتکاری ، ئەوەش نیعمەتێکی ئێجگار گەورە بوو لە پەروەردگارتانەوە ، بۆ ئەوەی تاقیتانبکاتەوە کە ئایا سوپاس وستایشی پەروەردگارتان دەکەن .

﴿وَإِذۡ فَرَقۡنَا بِكُمُ ٱلۡبَحۡرَ فَأَنجَيۡنَٰكُمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ٥٠﴾

ودەریامان بۆ کەرتکردن ورێگای وشکانیمان بۆ کردنەوە ، بە هۆیەوە رزگارمانکردن وفیرعەون ودارودەستەکەیمان لە دەریادا خنکاند ونغرۆمانکردن بەپێش چاوتانەوە .

ئەم ئایەتە دەرخەری دەسەلاَتی خودایە کە دەریای کەرت کرد ورێگای وشکانی تێدا کردەوە ، وئاوەکەی وەك شاخی گەورە بە راست وچەپی رێگاکەوە راگرت ، وزۆری نیعمەتەکانی تیایە بۆ نەوەکانی یەعقوب وریسواکردنی فیرعەون ودەست وپێوەندەکەی بەوەی کە پێی دەنازین ، ودەیگوت ئەم ئاوە لە ژێر پێی ئێمەوە ، یان لە ژێر کۆشك وتەلارەکانی ئێمەوە هەلْدەقولێت ، ودلْدانەوەی نەوەکانی یەعقوبە بەوەی دوژمنەکەی بەپێش چاویانەوە لە ناوبرد ، بوخاری لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ریوایەتی کردووە دەلێت کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ کۆچیکرد بۆ مەدینە جوولەکەکانی مەدینە دەی مانگی المحرم بە رۆژوو دەبوون پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون : بۆ بەرۆژوودەبن ؟ وتیان : ئەمرۆ ئەو رۆژەیە کە خودا نەوەکانی یەعقوبی لە دەستی فیرعەون رزگارکردووە ، فەرمووی : ئێمە لە پێشترین بۆ پێغەمبەر موسا عليه السلام لە ئێوە ، بۆیە رۆژووی عاشورای گرت وفەرمانی بە ئوممەتەکەی کرد بەرۆژووبن لەو رۆژە دا .

الجُزْءُ الأَوَّلُ | سُورَةُ البَقَرَةِ

وَإِذۡ نَجَّيۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ٤٩ وَإِذۡ فَرَقۡنَا بِكُمُ ٱلۡبَحۡرَ فَأَنجَيۡنَٰكُمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ٥٠ وَإِذۡ وَٰعَدۡنَا مُوسَىٰٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗ ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ٥١ ثُمَّ عَفَوۡنَا عَنكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٥٢ وَإِذۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡفُرۡقَانَ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ٥٣ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِنَّكُمۡ ظَلَمۡتُمۡ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلۡعِجۡلَ فَتُوبُوٓاْ إِلَىٰ بَارِئِكُمۡ فَٱقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ عِندَ بَارِئِكُمۡ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ٥٤ وَإِذۡ قُلۡتُمۡ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ فَأَخَذَتۡكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ٥٥ ثُمَّ بَعَثۡنَٰكُم مِّنۢ بَعۡدِ مَوۡتِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٥٦ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡغَمَامَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٥٧

٨

﴿وَإِذۡ وَٰعَدۡنَا مُوسَىٰٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗ ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾﴾ وكاتێك بەڵێنماندا بە موسا ﷺ چل شەو بێتە كێوی (طور) ، پاشان ئێوە دوای چوونی بۆ كێوەكە گوێرەكەكەتان پەرست وستەمتان لە خۆتانكرد .

ئەم چوونەی پێغەمبەر موسا ﷺ بۆ قسەكردن لەگەڵ پەروەردگاری دوای ڕزگاركردنی نەوەكانی یەعقوب بوو لە فیرعەون ، زۆربەی ڕاڤەكارانی قورئان دەڵێن ئەو چل ڕۆژە مانگی (ذوالقعده ودەی یەكەمی ذوالحجەبووە) ، سەرەتا كاتی بەڵێنەكەی خودای پەروەردگار سی ڕۆژ بوو بەڵام بۆی كامڵ كرد ودە ڕۆژی تری بۆ زیادكرد وتەوراتی پێبەخشی ، سەبارەت بە گوێرەكەكە پەیكەرێك بوو سامری لە خشڵ دروستی كردبوو وبە نەوەكانی یەعقوبی گوت : ئەمە خودای ئێوە وموسایە ! بەڵام ئەو لە بیری چووە ورێگەی هەڵە كردووە بۆیە نەگەڕاوەتەوە ؟! ، والطبری والقرطبی دەڵێن : ناوی موسا ناوێكی ئەعجەمی یە وعەرەبی نییە ولە دوو وشەی قیبتی پێكهاتووە كە (مو) واتە : ئاو ، (شا) واتە : دار ودرەخت ، وكاتێك كراوەتە عەرەبی بووەتە موسا لەبەر ئاسانی دەربڕینی ، دایكی موسا ﷺ موسای خستە نێو تابوتەكەوە وخستیە دەریاكەوە لە ترسی ئەوەی فیرعەون سەری نەبڕێت ، ئاوەكە بردیە نزیكیماڵی فیرعەون ، هەندێك كەنیزەكی ئاسیای خێزانی فیرعەون چووبوونە سەرئاو بۆ مەلەكردن ، ئەو تابوتەیان دۆزیەوە كە موسای تێدابوو ﷺ ئیتر بە ناوی ئەو شوێنەوە ناویاننا موسا ، وئەم ئایەتە بەڵگەی نەفامی وستەمكاری ئەو ئوممەتەی تێدایە كە تەنها چل ڕۆژ پێغەمبەرەكەیان لێیان دووركەوتەوە لە بری ئارامگرتن وشوكرانە بژێری ، پشتیان لە خودا پەرستی كرد وگوێرەكەیەكیان پەرست .

﴿ثُمَّ عَفَوۡنَا عَنكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٥٢﴾﴾ پاشان لێتان خۆشبووین وسزامان نەدان دوای ئەوەی تەوبەتانكرد وپەشیمانبوونەوە ، بۆ ئەوەی سوپاسی خودا بكەن .

سوپاسگوزاری بە یەکێك لەم شێوازانە دەبێت : لە دڵەوە خۆت بەمننەتبار وقەرزاری نیعمەت وفەزڵەکانی خودا بزانیت ، یان بەزمان دانبەوەدا بنێیت کە ئەوە فەزڵی پەروەردگارە ، ویان بە ئەندامەکانی جەستە گوێڕایەڵی خودا بکەیت وفەرمانبەرداربیت .

﴿وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ۝٥٣﴾ وئەوەش بە یاد بهێننەوە کە ئێمە کتێبمان بەخشییە پێغەمبەر موسا ﷺ کە تەورات بوو کە جیاکەرەوەی حەق وڕاستی لە پووچەڵ وناڕەوای تێدابوو ، بەڵکو بە هۆیەوە هیدایەت وڕێنمایی وەربگرن .

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە ناردنە خوارەوەی کتێبەکانی پەروەردگار نیعمەتێکی گەورەیە لەبەر ئەوەی مننەتی بەسەر نەوەکانی یەعقوبدا پێکردووە ، وئەوەی کە موسا ﷺ پێغەمبەری ڕەوانەکراوە لەبەر ئەوەی کتێبی پێبەخشراوە ،وهەروەها گەورەیی تەوراتی تێدایە کە پێغەمبەرانی دوای موسا ﷺ حوکمیان پێکردووە ، وئەوەش کە لە سیفەتی جیاکەرەوەی حەق لە ناڕەوادا هاوبەشە لەگەڵ قورئانی پیرۆز .

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓاْ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥٤﴾ وکە پێغەمبەر موسا ﷺ بە گەلەکەی فەرموو : ئەی گەلەکەم ئێوە بەڕاستی ستەمتان لە نەفسی خۆتانکرد بەوەی گوێرەکەیەکتان کردە پەرستراو لە جیاتی خودا پەرستان ، لەبەر ئەوە تەوبە بکەن وبۆ لای دروستکارتان بگەڕێنەوە وخۆتان بکوژن ، ئەوە باشترە بۆتان لای دروستکارتان کە تەوبەی لێوەرگرتوون ولێتان خۆشبووە ، بە دڵنیاییەوە خودا زۆر تەوبەی بەندەکانی وەردەگرێت وخاوەن بەزەییەکی فراوانە کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە .

خودای گەورە فەرمانی پێکردن بە کوشتنی یەکتر ، ئەمەش وەك سزا وتاقیکردنەوەیەك ، لە سزای ئەو کردەوە خراپ ونابەجێیەیان کە پەرستنی گوێرەکەکە بوو ، هەندێکیان هەندێکی تریان کوشت ، پاشان خودا لێیان خۆشبوو وتەوبەی قەبوڵکردن ، ئەمە یەکێك بوو لەو کۆت وبەندانەی کە پێویست کرابوو لەسەر نەوەکانی یەعقوب لەبەر ئەوەی گەلێکی ستەمکاری لە سنوور دەرچووبوون .

﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾﴾ وئەوەی بە پێغەمبەر موساتان وت عليه السلام هەرگیز باوەڕ بە تۆ ناهێنین هەتا خودا بە ئاشکرا نەبینین ، هەورە بروسکەیەك یان دەنگێکی گەورە یان ئاگرێك لە ئاسمانەوە هەمووتانی کوشت ، لە کاتێکدا سەیری یەکترتان دەکرد کە بەسەر زەویدا دەکەوتن .

لە دونیادا خودا نابینرێت بەڵام ئایەت وفەرموودەی زۆر هاتووە کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە باوەڕداران لە بە هەشتدا خودا دەبینن ، ولەبەر گەورەیی نیعمەتی بینینی خودای پەروەردگار هەموو نازونیعمەتەکانی تری بەهەشتیان بیردەچێتەوە ، زانایان ناکۆکن ئەم ڕووداوە کەی ڕوویداوە هەندێکیان دەڵێن : لەو کاتەدا بووە کە پێغەمبەر موسا عليه السلام حەفتا پیاوی لە گەلەکەی هەڵبژارد بۆ ئەو کاتەی کە خودای پەروەردگار بۆی دیاری کردبوون بۆ ئەوەی داوای لێبوردن ولێخۆشبوون لە خودا بکەن ، لەبەر ئەوەی گوێرەکەیان پەرستبوو ، لەو کاتەدا وتیان : باوەڕ ناهێنین هەتا خودا بە ئاشکرا نەبینین ، وهەندێکی تر دەڵێن : دوای ئەوەی پێغەمبەر موسا عليه السلام گەڕایەوە لە کێوی (طور) وخودا تەوراتی پێبەخشیبوو ، وتیان : باوەڕ ناهێنین کە ئەم کتێبە خودا بۆی دابەزاندووی وپێی بەخشیویت ، هەتا خودا بە ئاشکرا نەبینین ، ئیبن عثيمين دەڵێت : ڕیزبەندی ئایەتەکان بەڵگەیە لەسەر بۆچوونی دووەم چونکە دەفەرموێت : ﴿وَإِذْ

﴿ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ﴾ ، پاشان باسی بەسەرهاتی گوێرەکەکە دەکات ، ئەمەش دوای ئەوە بوو موسا ﷺ تەوراتی پێبەخشرابوو ، پاشان ئەو باسە دەگێڕێتەوە ودەفەرموێت : ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً﴾ ؛ وئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەرکەس داوای شتێك بکات کە شیاو نەبێت شایستەی سزادانە ، چونکە خودا بە هۆی ئەو داواکاریەیانەوە سزایدان ولە ناویبردن ، وئەوەی کە پێغەمبەر موسا ﷺ فەرموویەتی : ﴿أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ ١٤٣﴾(الأَعۡرَافِ) ڕوخسەتم بدە بتبینم ، جیاوازە لەو داوایەی ئەوان ، لەبەر ئەوەی ئەوان گومانیان لە پەروەردگار هەبوو ، بەڵام پێغەمبەر موسا ﷺ تامەزرۆی دیداری پەروەردگاری بوو .

﴿ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ٥٦﴾ پاشان زیندوومانکردنەوە دوای ئەو مردنەتان بۆ ئەوەی سوپاسی خودا بکەن .

ئەمەش منەت ونیعمەتێکی تری خودای پەروەردگاربوو بەسەر نەوەکانی یەعقوبەوە ، دوای ئەوەی کە ڕۆحی کێشان زیندووی کردنەوە بۆ ئەوەی پەند وئامۆژگاری وەربگرن .

﴿وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۚ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ٥٧﴾ وهەورمان کرد بە سێبەر بەسەرتانەوە کاتێك ڕێگەتان هەڵەکرد وونبوون ، وگەزۆ وباڵندەی شیلاقەمان بۆ دابەزاندن ، بخۆن لەو شتە پاکانەی کە ڕۆزیماندان ، هەموو ئەو تاوانانەی کە ئەنجامیاندا زیان بە ئێمە نایەگەیەنێت ، وستەم لە ئێمە ناکەن بەڵکو تەنها ستەمیان لە نەفسی خۆیان دەکرد .

الجُزْءُ الأَوَّلُ سُورَةُ البَقَرَةِ

وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُواْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُواْ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِي قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾ وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ كُلُواْ وَٱشْرَبُواْ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْاْ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِي هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِي هُوَ خَيْرٌ ٱهْبِطُواْ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُواْ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾



٩

کاتێك نەوەکانی یەعقوب لە دەریای سور پەڕینەوە لە میسرەوە بۆ شام پێغەمبەر موسا عليه السلام داوای لێکردن بچنە قودسەوە وشەڕ لەگەڵ دوژمنەکانیان بکەن گوێڕایەڵیان نەکرد ، وسوپاسگوزاری نیعمەتەکانی خودایان نەکرد ، بۆیە خودا سزایدان بەوەی چل ساڵ وێڵ وسەرگەردانی کردن ، لەو حاڵەشدا خودا بەزەیی بە حاڵیاندا هاتەوە وهەورێکی سپی بۆ کردنە سێبەر بۆ ئەوەی لە گەرمی تیشکی خۆر بیانپارێزێت ، وباشترین جۆری خواردنی بۆ دابەزاندن ، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو نیعمەتانەشدا هەر سەرکەش وستەمکاربوون ، وشوکرانەبژێر نەبوون بۆیە خودا پێیان دەفەرموێت : ستەمکاربوون وستەمیان لە نەفسی خۆیان کرد ، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە دەبێت مرۆڤ بە گوێرەی پێویست لەو خۆراکە حەڵاڵانە بخوات کە پێویستی پێیانە ، لەم بارەیەوە ئیبن تیمیە دەڵێت : هەرکەس وازبهێنێت لە خواردنی شتە پاکە حەڵاڵەکان بەبێ هۆیەکی شەرعی ئەوە سەرزەنشتکراوە .

﴿وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُواْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُواْ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾﴾ وئەوەی کە پێمان فەرموون : بچنە نێو ئەم شارەوە کە شاری قودس بوو ، تێیدا بخۆن ئەوەی ئارەزووی دەکەن ، بە ئاسودەیی لەهەر

کونجێکی شارەکە ویستتان ، هەرکە لە دەروازەی شارەکە چوونە ژوورەوە سوژدەبەرن ، وەك سوپاس وپێزانین ودانپێدانانی ئەو نیعمەتانەی پەروەردگار بەسەرتانەوە وبڵێن : خودایە لە تاوانەکانمان خۆشبە ولێمان ببورە ، ئەو کات تاوانەکانتان دەپۆشین ولێتان دەبورین وسزاتان نادەین ، وزیاتر لەوانەش بە چاکەکاران دەبەخشین .

بۆیە لێرە خودا ﷻ دەفەرموێت : بخۆن لەهەر کونجێکی ئەم شارە چۆن ویستتان ، ئەمە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە دەستکەوتەکانی شەڕی بۆ نەوەکانی یەعقوب حەڵاڵکردووە کە لە بنەڕەتدا لە سەریان حەرامبوو ، ئەم ئایەتە وەك چەندان ئایەتی تر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خودای پەروەردگار قسە دەکات چۆن بیەوێت وکەی بیەوێت ؛ وچاکەکاری دووجۆرە : چاکەکاری لە پەرستنی پەروەردگار ، کە بەو شێوەیەبێت هەست بە چاودێری پەروەردگار بکەیت ئەگەر تۆ خودا نەبینیت دەبێت دڵنیابیت کە خودا تۆ دەبینێ ، وچاکەکاری لەگەڵ دروستکراوەکانی خودا ، بە چاکە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیان ویارمەتیدانیان لە کاتی پێویستی وپارێزراو بوون لە دەم ودەستت .

﴿فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ۝٥٩﴾ ئەو کەسانەی ستەمکاربوون ئەوەی فەرمانمان پێکردن گۆڕییان وگاڵتەیان لێهات وشەی تریان وت ، بە هۆکاری ئەو کردەوە نابەجێیەیان سزامان لە ئاسمانەوە بۆ دابەزاندن ، چونکە سەرپێچی فەرمانی خودایان کردبوو .

بوخاری ومسلم لە ئەبوهریرەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : وترا بە نەوەکانی یەعقوب لە دەروازەی شارەکە چوونە ژوورەوە سوژدەبەرن وەك سوپاس وپێزانین ودانپێدانانی ئەو نیعمەتانەی پەروەردگار بەسەرتانەوە ، وبڵێن : خودایە لە

تاوانەکانمان خۆشبە ولێمان ببورە ، ئەوەیان گۆڕی ، وبۆ دواوە بەپشتدا چوونە ژوورەوە ووتیان دەنکە دانەوێڵە یان دەنکە جۆ ، گاڵتەیانکرد وسەرکەش وکەللە ڕەقبوون ، لە سزای ئەو گاڵتەجاڕیەیان خودا سزای بۆ دابەزاندن ، الطبری دەڵێت : ئەو سزایەی لە ئاسمانەوە خودا دایبەزاندووە بۆ ئەو ستەمکارانەی نەوەکانی یەعقوب دەشێت نەخۆشی تاعون وسك ئێشەبێت ، هەرکەس خودا نیعمەتێکی پێبەخشی پێویستە مننەتبار وسوپاسگوزاربێت بۆ ئەوەی خودا سزای نەدات لەسەر نیعمەتەکانی ، وهەروەها ترسناکی گۆڕینی حوکم وفەرمانەکانی خودا وپێغەمبەرەکەی ﷺ ، یان گاڵتەکردن وسووکایەتی کردن بە فەرمانەکانی ئاین .

﴿۞وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾﴾ وئەو نیعمەتەشیان بە یاد بهێنەوە کاتێك موسا ﷺ داوای ئاوی کرد بۆ گەلەکەی ، پێمان فەرموو : گۆچانەکەت بکێشە بە بەردداا ، دوازدە کانیاو هەڵقوڵا ، هەر تیرەیەك شوێنی ئاوخواردنەوەی خۆی دەزانی ودیاریکراو بوو ، بخۆن وبخۆنەوە لە ڕۆزی خودا ولەسەر زەوی خراپە وتاوان وبشێوی مەنێنەوە .

هۆکاری سەرەکی خراپە لەسەر زەوی بەرهەمی دەستی مرۆڤەکانە هەروەك خودا دەفەرموێت : ﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴿٤١﴾﴾(الرُّوم) ، وئەو گۆچانەی دەستی پێغەمبەر موسا ﷺ چوار بەڵگە ونیشانەی گەورە بوو لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتیەکەی : کاتێك فڕێیدەدا دەبوو بە مار ، وکە دەیکێشا بە بەردداا ئاوی لێ هەڵدەقولا ، وکێشای بە ئاوی دەریاکەدا ئاوەکە شەقبوو وڕێگای وشکانی تێداکرایەوە بۆ پەڕینەوەی نەوەکانی یەعقوب ورزگاربوونیان لە دەستی فیرعەون

وداروودەستەکەی ، کاتێك جادووبازەکان کۆبوونەوە فرێیدا هەموو جادووەکەیانی بەتاڵکردەوە وهەڵیلوشین ؛ وهەروەها لە بەخشندەی وبەزەیی پەروەردگار بوو بۆیان دوازدە چاوگی ئاوی بۆ هەڵقولاندن وتەنها یەك چاوگ نەبوو بۆ ئەوەی نارەحەت وماندوونەبن لە کاتی ویستی دەست خستنی ئاودا .

﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾﴾ وئەو نیعمەتەشمان بە یاد بهێننەوە کە بە موسای پێغەمبەرتان ﷺ وت : ئێمە ئارام ناگرین لەسەر یەك جۆر خواردن ، لە پەروەردگارت داوا بکە با لە زەوییەوە سەوزە وخەیار ترۆزی وسیر ونیسك وپیازمان بۆ برِوێنێت ، موسای پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون : ئایا شتێك کە زۆر باشتر وبەتام وچێژترە کە گۆشتی باڵندەی شیلاقە وگەزۆیە دەیگۆرِنەوە بەوەی کەمترە وئەو تام وچێژەی نییە ؟! ، ئەوانەی داوای دەکەن برِۆنە هەر شارێك دەستان دەکەوێت ، بەلاَم ئەوەی خودا بە ئێوەی بەخشیوە شتی زۆر تایبەت وناوازەیە ، لە سزای ئەو خراپەکاری وناسوپاسگوزاریەیان رِیسوایی وزەبوونی وهەژارییان بەسەردا سەپێنرا وخودایان لیٚ تورِەبوو ، ئەوەی تووشی بوون لەبەر ئەوەبوو بەڵگە ونیشانەکانی خودای پەروەردگاریان بە درۆ دەزانی وباوەرِیان پێنەهێنا وپێغەمبەرەکانیان دەکوشت بە نارِەوا ، چونکە تاوانکار وستەمکار وسنوور بەزێن بوون .

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْاْ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُواْ بَقَرَةً قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ فَٱفْعَلُواْ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾



﴿بَقْلِهَا﴾ كه له ئایەتەكەدا هاتووه هەموو جۆره ڕووەكێكه كه قەدی نەبێت ، ئەم ئایەته بەڵگەی گەمژەیی ئەو كەسانەی تێدایه كه شتی باش دەگۆڕنەوه به شتێك ئەو بەهایەی نەبێت جا ئەوه بۆ هەموو شته ماددی ومەعنەویەكانیش ڕاسته ، كوشتنی هیچ كام له پێغەمبەران به هیچ شێوەیەك ڕەوا نییه ، وئەوەی دەفەرموێت : پێغەمبەران دەكوژن به ناحەق بۆ دەرخستنی گەورەیی وخراپی ئەو كرداره قێزەونەیه ، ئەحمەد والطبرانی له ئیبن مسعودەوه ﵁ ڕیوایەتیان كردووه وئەلبانی به حەسەنی داناوه ، دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : یەكێك لەو كەسانەی كه توندترین سزا دەدرێت له ڕۆژی قیامەتدا كەسێكه پێغەمبەرێكی كوشتبێت یان پێغەمبەرێك ئەوی كوشتبێت ، وكەسێكیش كه خەڵك گومڕا بكات بەبێ زانست ، ووێنەكێشێك وێنەی پەیكەر بكێشێت .

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾ بێگومان باوەڕدارانی ئەم ئوممەته وجوولەكەكان وگاورەكان وصابیئەكان هەركەس باوەڕ به خودا ودوارۆژبهێنێت

وکردەوەی باش ئەنجامبدات ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاریانە وهیچ ترس وبیمێکیان نییە لە قیامەتدا ، وخەفەتیش ناخۆن بۆ ئەوەی کە لە دونیا بە دەستیان نەهێناوە .

کاتێك خودای پەروەردگار باسی سزای ئەو کەسانەی کرد کە سەرپێچیکار وسنوربەزێن بوون بۆ ئەوەی گومانی ئەوە دروست نەبێت کە هەموو ئوممەتەکانی تر لە ئاگردان ئەو کەسانەی هەڵاوێردەکرد کە باوەڕداربوون ، وئەم ئایەتە سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کە هەرکەس لە ئوممەتە پێشینەکانیش باوەڕی بە خودا ورۆژی دوایی وپێغەمبەرەکەی هێنابێت وکردەوەی باشی ئەنجام دابێت پاداشتی لای خودای پەروەردگاریەتی وەك باوەڕدارانی ئوممەتی ئیسلام ، سەبارەت بە ناوی ﴿هَادُواْ﴾ بە ئەو کەسانە دەگوترێت کە خۆیان داوەتە پاڵ شەریعەتی پێغەمبەر موسا ﷺ یان وتراوە : مانای گەڕانەوە وپەشیمان بوونەوەیە لە دوای ئەوەی گوێرەکەکەیان پەرست وپەشیمان بوونەوە یان ئەمە خۆدانە پاڵی یهوذای کوڕە گەورەی یعقوب پێغەمبەر ﷺ کاتێك بووەتە عەرەبی بووەتە یهود ، و﴿ٱلنَّصَٰرَىٰ﴾ ئەو کەسانەن خۆیان داوەتە پاڵ شەریعەتەکەی عیسا پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوەی یەکتریان سەردەخست ئەو ناوەیان لێنراوە ، یان نیشتەجێی شوێنێك بوون ناوی (ناصرە)بووە ، ونابێت پێیان بگوترێت مەسیحی چونکە لە قورئاندا بە نەصارا ناویات هاتووە ، مەسیحی مانای ئەوەیە شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی پێغەمبەر عیسان ﷺ ئەمەش لە واقیعدا وانییە ، بەڵکو بێباوەڕ وهاوبەش دانەرن ودەڵێن سێ خودا هەیە ؟! ، ئەو ناوەشیان بۆ شەرعییەتدان بەوەی پەیڕەوی دەکەن داهێناوە ، و﴿ٱلصَّٰبِـِٔينَ﴾ زانایان ناکۆکن دەربارەیان هەندێك دەڵێن : کۆمەڵێکن لە گاورەکان ، ووتراوە فریشتە دەپەرستن ، یان ئاگر دەپەرستن ، یان خۆیان بە شوێنکەوتەی پێغەمبەر داود ﷺ دەزانن وزەبور دەخوێننەوە ، یان هیچ ئاینێکیان نییە وئەمانە بۆچونی تریش هەیە دەربارەیان ، ئیبن عەباس رضي الله عنهما دەڵێت : دوای ئەم ئایەتە خودا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ

فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٨٥﴾(آلِ عِمْرَانَ) ، کەواتە کەس هیچ ڕێگە وکردەوەیەکی لێ قەبوڵ ناکرێت دوای هاتنی پێغەمبەری خودا محمد ﷺ ئەگەر باوەڕ بە پێغەمبەری خودا ﷺ نەهێنێت ،ولەسەر شەریعەتی ئیسلام نەبێت ، بەڵام پێش ئەو هەرکەس شوێن پێغەمبەرەکەی سەردەمی خۆی کەوتبێت ئەوە لەسەر ڕێگای ڕاست وهیدایەت بووە لە قیامەتدا خودا پاداشتیان دەداتەوە.

﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾﴾ وئەوەش بە یاد بهێننەوە کە پەیمانی جەخت لێکراومان لێوەرگرتن ، وکێوی طورمان بەرزکردەوە وبەسەرتانەوە ڕامانگرت وکردمانە سێبەر بەسەرتانەوە ودەترسان بکەوێت بەسەرتاندا ، ئەوەی بۆمان ڕەوانەکردوون توند دەستی پێوە بگرن ، وپەند وئامۆژگارییەکانی بە یاد بهێننەوە بەڵکو لە پارێزکاربن ولە خودا بترسن .

کێوی طور کێوێکە لە دەشتی سینای وڵاتی میسر خودای پەروەردگار ئەو شوێنەی بۆ پێغەمبەر موسا ﷺ دیاریکردبوو بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵ بکات ، ئەو کتێبەی پێمان بەخشیوون کە تەوراتە بە توندی دەستی پێوەبگرن وبیخوێننەوە وکردەوەی پێبکەن بۆ ئەوەی پارێزکاربن ولە خودا بترسن ، بۆیە پێویستە موسڵمانان وانەی دامەزران وتوند دەستگرتن بە سوننەتەوە لەم ئایەتە وهاوشێوەکانی فێربن وکەمتەرخەم وسست وتەمبەڵ نەبن ، وئیسلام بەو گشتگیرییەی کە هاتووە هەوڵی پەیڕەویکردنی بدەن .

﴿ثُمَّ تَوَلَّيۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۖ فَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾﴾ پاشان دوای ئەو پەیمان وبەڵێنە جەخت لێکراوەی کە لێمان وەرگرتن پشتتان هەڵکرد وپەیمانەکەتان شکاند وبەڵێنەکەتان نەبردە سەر ، ئەگەر فەزڵ وبەزەیی خودا نەبووایە بەسەرتانەوە لە زەرەرمەندان دەبوون لە دونیا ودوارۆژیشدا .

﴿وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعۡتَدَوۡاْ مِنكُمۡ فِي ٱلسَّبۡتِ فَقُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ٦٥﴾
بێگومان باش ئەو كەسانەتان دەناسی وبەسەرهاتەكەیانتان دەزانی كە لە ڕۆژی شەممەدا ڕاوە ماسیان لێ قەدەغەكرابوو سەرپێچییانكرد ، ولەو ڕۆژەدا ڕاویانكرد ، بۆیە پێمان فەرموون : ببن بە مەیمون وڕیسوا وسەرشۆڕبن .

باسی دانیشتوانی ئەو شارە بە درێژی لە سورەتی الأعرافدا هاتووە لەو ئایەتەوە كە دەفەرموێت : ﴿وَاسْأَلْهُمْ عَنِ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ حَاضِرَةَ الْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِي السَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ ۙ لَا تَأْتِيهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ١٦٣﴾(الأَعْرَافِ) .

﴿فَجَعَلۡنَٰهَا نَكَٰلٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهَا وَمَا خَلۡفَهَا وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ٦٦﴾ ئەو بەسەرهاتەمان كردە پەند بۆ ئەو خەڵكەی لەو سەردەمەدا دەژیان وبۆ نەوەكانی دوای ئەوانیش ، وكردمانە ئامۆژگاری بۆ پارێزكاران .

ئەم ئایەتە دەبێت هەموو ئەوكەسانە ڕابچەڵەكێنێت كە گوێ نادەنە قەدەغەكراوەكان كە لەوانەیە لەبەر یەك سەرپێچی وسنوربەزاندن خودا سزای توندیان بدات لە دونیا ولە قیامەتیشدا.

﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تَذۡبَحُواْ بَقَرَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوٗاۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ٦٧﴾ وئەوەشیان بە یاد بهێننەوە كاتێك پێغەمبەر موسا عليه السلام بە گەلەكەی فەرموو : خودا فەرمانتان پێدەكات كە مانگایەك سەرببڕن ، وتیان گاڵتە ولاقرتیمان

پێدەکەیت ، فەرمووی پەنا بەخودا دەگرم لەوەی کە لە نەفامەکان بم ، وقسەیەك بکەم بێمانا وبێ سودبێت .

ئەمە کاتێك بوو کەسێك لە نەوەکانی یەعقوب کوژرابوو ودادگەرییان هێنا بۆ لای پێغەمبەر موسا ﷵ ووتیان : کەسێك کوژراوە ونازانین بکوژەکە کێیە ؟ پێی فەرموون : مانگایەك سەر ببڕن ؟! سەریان سوڕما ووایانزانی گاڵتەیان پێدەکات ؛ لەو کاتەدا هەر مانگایەکیان سەربڕیبا فەرمانەکەی پەروەردگار جێبەجێ دەبوو ، بەڵام توندیان کرد لەسەر خۆیان وخوداش توندی کرد لەسەریان ، ئەم ئایەتە دوو وانەی زۆر گەورە وگرنگی تێدایە : ئەگەر شتێك عەقڵ وژیری ئێمە پەی پێنەبرد ونەیتوانی لێی تێبگا دەبێت ملکەچ بین وباوەڕ بهێنین ، ودەبێت فەرمانەکانی ئاین بە ڕاستی وەربگرین وگاڵتەجاڕی نەکەین کاتێك باسی حوکم وفەرمانێکی خودا یان پێغەمبەرەکەی ﷺ کرا .

﴿قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا فَارِضٞ وَلَا بِكۡرٌ عَوَانُۢ بَيۡنَ ذَٰلِكَۖ فَٱفۡعَلُواْ مَا تُؤۡمَرُونَ ٦٨﴾ وتیان : بە پەروەردگارت بڵێ بۆمانی ڕوون بکاتەوە کام مانگا سەربڕین ؟ پێغەمبەر موسا ﷵ فەرمووی خودا دەفەرموێت : مانگایەك کە پیر نەبێت وگوێرەکەیەکی بچووکیش نەبێت بەڵکو تەمەنی مامناوەند بێت ، دەی ملکەچ وفەرمانبەرداربن وئەوەی فەرمانتان پێکراوە جێبەجێی بکەن .

ئێستاش ئەگەر مانگایەکی تەمەن مامناوەندیان سەربڕیبا فەرمانەکەی خودا جێبەجێ دەبوو ، بەڵام ئەوان هەر بەردەوام بوون لە پرسیارکردن .

﴿قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوۡنُهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ صَفۡرَآءُ فَاقِعٞ لَّوۡنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّـٰظِرِينَ ٦٩﴾ وتیان : بە پەروەردگارت بڵێ بۆمانی ڕوون بکاتەوە ڕەنگی چۆن بێت ؟ پێغەمبەر موسا ﷺ فەرمووی خودا دەفەرمویت : مانگایەکە ڕەنگی زۆر زەردە وهیچ ڕەنگێکی تر تێکەڵی ڕەنگی پێستی نییە ، تەماشاکارانی دڵخۆش وسەرسام دەکات بە جوانی ڕەنگەکەی .



قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ ٱلۡبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيۡنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهۡتَدُونَ ٧٠ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا ذَلُولٞ تُثِيرُ ٱلۡأَرۡضَ وَلَا تَسۡقِي ٱلۡحَرۡثَ مُسَلَّمَةٞ لَّا شِيَةَ فِيهَاۚ قَالُواْ ٱلۡـَٰٔنَ جِئۡتَ بِٱلۡحَقِّۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفۡعَلُونَ ٧١ وَإِذۡ قَتَلۡتُمۡ نَفۡسٗا فَٱدَّٰرَٰٔتُمۡ فِيهَاۖ وَٱللَّهُ مُخۡرِجٞ مَّا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ٧٢ فَقُلۡنَا ٱضۡرِبُوهُ بِبَعۡضِهَاۚ كَذَٰلِكَ يُحۡيِ ٱللَّهُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ٧٣ ثُمَّ قَسَتۡ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَٱلۡحِجَارَةِ أَوۡ أَشَدُّ قَسۡوَةٗۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلۡحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنۡهُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخۡرُجُ مِنۡهُ ٱلۡمَآءُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَهۡبِطُ مِنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ٧٤ ۞ أَفَتَطۡمَعُونَ أَن يُؤۡمِنُواْ لَكُمۡ وَقَدۡ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعۡدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ٧٥ وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ قَالُوٓاْ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمۡۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ٧٦






﴿قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ ٱلۡبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيۡنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهۡتَدُونَ ٧٠﴾
بەوەش وازیان نەهێنا دیسان پرسیاریانکرد ووتیان : بە پەروەردگارت بڵێ بۆمانی ڕوون بکاتەوە ! ، چونکە بە ڕاستی لێمان تێکەڵ بووە ومانگاکان زۆر وچوونیەکن وئەو مانگایە نادۆزینەوە کە باسی دەکەیت ، دوای ئەو ڕوون کردنەوەیە بەدڵنیاییەوە بە ویستی خودا ئەو مانگایە دەدۆزینەوە وسەری دەبڕین .

﴿قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا ۚ قَالُوا۟ ٱلْـَٔـٰنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾﴾ پێغەمبەر موسا ﷺ فەرمووی خودا دەفەرموێت : مانگایەکە ڕانەهێنراوە بۆ جووتکردن وزەوی پێنەکێڵراوە ، وئاودێری کشتوکاڵیشی پێنەکراوە ، وساغ وتەندروستە ویەك ڕەنگە ، وتیان : ئێستا ئەوەی مەبەستە بۆمان دەرکەوت وبۆمان ورِوون بوویەوە ، یان ئێستا بۆمان دەرکەوت کە تۆ ئەی موسا ﷺ بە ڕاستتە وگاڵتەمان پێناکەیت ، ئەو مانگایەیان دۆزییەوە کە خودای پەروەردگار بۆی باسکردن وسەریان بڕی هەرچەندە خەریکبوو سەری نەبڕن لەبەر ئەو دەمەقاڵەی کردیان وئەو کەللەڕەقیەی کە نواندیان .

﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَٱدَّٰرَْٰتُمْ فِيهَا ۖ وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴿٧٢﴾﴾ وئەوەشیان بە یاد بێهننەوە کە کەسێکتان کوشتبوو وهەرکەسە تۆمەتەکەی لە خۆی دوور دەخستەوە ، وبەرامبەرەکانی پێ تۆمەتبار دەکرد ودەمەقاڵەتان بوو ، بەڵام خودا ئەوەی دەربارەی بکوژەکە شاردتانەوە دەریدەخات .

وەك باسکرا هۆکاری ئەوەی کە پێغەمبەر موسا ﷺ فەرمانی پێکردن کە مانگایەك سەر ببڕن ئەوە بوو کەسێك کوژرابوو وبکوژەکەی نەناسراو بوو ، وبۆ ئاشکراکردنی خودا فەرمانی پێکردن ئەو مانگا سەربڕن .

﴿فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ۚ كَذَٰلِكَ يُحْىِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾﴾ سروشمان بۆ پێغەمبەرەکەمان موسا ﷺ کرد وپێمان فەرموون : کوژراوەکە بکێشن بە بەشێك لەو مانگایەدا کە سەرتان بڕی ، خودا بەو پیاکێشانە مردووەکەی زیندوو کردەوە ، هەر بەو

شێوەیە خودا مردووەکان زیندوو دەکاتەوە ، وبەڵگە ونیشانەکانیتان پیشان دەدات بۆ ئەوەی تێبفکرن لە ئایەتەکانی خودا وتێبگەن .

ئەو بەشەی مانگاکە دیاری نەکراوە کە خودا فەرمانیکردووە مردووەکەی پێدا بکێشن وبەشاراوەیی هێشتویەتیەوە ، ولەبەر ئەوەی بەڵگەی صەحیح لەبەر دەستدا نییە کە ساغی بکاتەوە چ بەشێکی بووە بێ دەنگی لە ئاست دیاریکردنی باشە ، وئەگەر سوودێکی تێدابووایە بێگومان خودا ﷻ باسی دەکرد ، السدی دەڵێت : دوای ئەوەی زیندووبوویەوە پرسیاریان لە کوژراوەکە کرد ، وتی : برازاکەم منی کوشت .

﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾﴾ پاشان دڵتان ڕەقبوو لە دوای هەموو ئەو بەڵگە ونیشانانەی پیشانماندان کەوەك بەردەکانە لە ڕەقیدا بەڵکو ڕەقترە ، یان وتراوە : ئەگەر لە بەردەکان ڕەقتر نەبێت وەك ئەوانە لە ڕەقیدا ، وهەرگیز نەرم نابێتەوە ، چونکە هەندێك بەرد دەتەقنەوە ودەریاکانیان لێ هەڵدەقوڵێت ، وهەندێکی تر شەق شەقدەبن وئاویان لێدێتە دەرەوە ، وهەندێکی تر لە ترسی خودا لە شاخەکانەوە بەردەبنەوە ، وخودا بێئاگا نییە لە هەر کار وکردەوەیەك کە ئەنجامی دەدەن .

ئەم ئایەتە سەرزەنشت وهەڕەشەیەکی توندە لە نەوەکانی یەعقوب وهەرکەسێك هاوشێوەی ئەوان بێت ، چونکە بە هەموو ئەو بەڵگە ونیشانانەی خودای پەروەردگار نیشانیدان پەند ووانەیان وەرنەگرت ، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە بری ئەوەی دڵیان نەرم بێت بەڵام لە بەرد ڕەقتربوو ، ووانەی ئەوەشی تێدایە کە هەرکەس هیدایەت وڕێنمایی لە ئایەت وبەڵگەکانی

قورئان وسوننەت ، یان ئایەتە گەردوونیە ماددییەکان وەرنەگرێت گومڕا وسەرلێشێواو دەبێت ودڵی ڕەق وڕەش دەبێت ، وپێوەرەکانی لێ تێکدەچێت وڕاستی بە ناڕەوا وناڕەوا بە ڕاستی دەزانێت .

﴿۞أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُواْ لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾﴾ ئایا ئێوە ئومێدەوارن وبە تەمای ئەوەن جوولەکە باوەڕ بە ئاینەکەی ئێوە بهێنن ؟! ، لە کاتێکدا کۆمەڵێك لەوان فەرموودەی خودایان دەبیست وبە هەڵە لێکیان دەدایەوە وماناکەیان تێکدەدا ، لە کاتێکدا بە باشی لێی تێدەگەیشتن وبە زانینەوە ئەو چەواشەکارییەیان دەکرد .

خودای پەروەردگار دەیەوێت باوەڕداران بێئومێد بکات بۆ ئەوەی بە تەمانەبن کە جوولەکەکان باوەڕبهێنن ، چونکە بابوباپیرانی ئەوان هەموو ئەو بەڵگە ونیشانانەیان بە چاوی خۆیان بینی باوەڕیان بە پێغەمبەر موسا ﷷ نەهێنا ئیدی چۆن باوەڕ بە محمد ﷺ دەهێنن ؟! .

﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوٓاْ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمْۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٧٦﴾﴾ جوولەکەکان ئەگەر بگەیشتنایە بە باوەڕداران دەیانگوت : ئێمە باوەڕمان هێناوە ، بەڵام ئەگەر خۆیان بە تەنها بوونایە دەیانگوت ئەوە چۆن باسی ئەوە بۆ موسڵمانان دەکەن کە لە تەوراتدا هاتووە دەربارەی ڕاستی ئاینی ئیسلام ومحمدی پێغەمبەر ﷺ تا بیکەنە بەڵگە بەسەرتانەوە لای پەروەردگارتان ، وبیانووتان ببڕن ، ئایا ئێوە عەقڵ وژیریتان لە دەستداوە ؟! .

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە دەبێت باوەڕدار هەڵوێستی ڕوون بێت وچەند قسە نەبێت لای هەر کۆمەڵە خەڵکێك بەو شێوەیە قسە بکات کە دڵی ئەو خەڵکانە دەیخوازێت ، وبچێتە لای هەر تاقم وگروپێك بڵێت : منیش لەگەڵ ئێوەم چونکە بوخاری ومسلم لە ئەبوهریرەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : دەبینیت لە خراپترین کەسەکان لە ڕۆژی قیامەتدا لای خودای پەروەردگار کەسانی دووڕوون ، دەچێتە لای ئەم کۆمەڵە خەڵکە بە ڕوویەك وگوتارێك ، ودەچێتە لای کۆمەڵەکەی تر بە ڕوویەکی تر ووتارێکی جیاواز ، هەر لەم بارەیەوە ئەبوداود لە عەماری کوڕی یاسرەوە ﵄ ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : لە دونیا هەرکەس دوو ڕووی هەبێت ، لە ڕۆژی قیامەتدا دوو زمانی هەیە لە ئاگر ، هەروەها بوخاری لە "الأدب المفرد"دا لە ئەبوهریرەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : ناشێت کەسی دووڕوو کەسێکی ئەمانەتپارێزبێت .

﴿أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۝٧٧﴾ ئایا نازانن خودا زانایە بە ئەوەی دەیشارنەوە وبەوەش کە ئاشکرای دەکەن .

جوولەکەکان گومانیان وابوو کە ئەگەر بیروباوەڕ وکردار ونیەتی خراپی خۆیان بشارنەوە ، ولای موسڵمانان باسی نەکەن ، نابێتە بەڵگە بەسەریانەوە ، بەڵام خودا وەڵامی ئەو نەفامیەیانی دایەوە بەوەی کە زانایە بە ئاشکرا وپەنهانیان .

﴿وَمِنۡهُمۡ أُمِّيُّونَ لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَظُنُّونَ ٧٨﴾ هەندێك لە جوولەکەکان نەخوێندەواربوون ونەیاندەزانی تەورات بخوێننەوە وبنوسن تەنها خوێندنەوەیەکی کرچ وکاڵ نەبێت بەبێ تێگەیشتنی ماناکەی ، وگومانیان وابوو کە تەورات چەند کۆمەڵە خۆزگە وهیوایەك زیاتر هیچی تر نییە ، ئەوانە تەنها خەیاڵ دەکەن وگومان دەبەن وهیچ نازانن .

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەرکەس خوێندەواریش بێت ، بەڵام خوێندنەوەی ڕووکەشی بۆ دەقەکانی قورئان وسوننەت بکات ولە مانا ومەبەستیان تێنەگات بە نەخوێندەوار لە قەڵەم دەدرێت .

الجُزْءُ الأَوَّلُ　　سُورَةُ البَقَرَةِ

أَوَلَا يَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَ ٧٧
وَمِنۡهُمۡ أُمِّيُّونَ لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ وَإِنۡ هُمۡ
إِلَّا يَظُنُّونَ ٧٨ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ يَكۡتُبُونَ ٱلۡكِتَٰبَ بِأَيۡدِيهِمۡ
ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشۡتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلٗاۖ
فَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ
٧٩ وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَةٗۚ قُلۡ
أَتَّخَذۡتُمۡ عِندَ ٱللَّهِ عَهۡدٗا فَلَن يُخۡلِفَ ٱللَّهُ عَهۡدَهُۥٓۖ أَمۡ
تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٨٠ بَلَىٰۚ مَن كَسَبَ سَيِّئَةٗ
وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ
فِيهَا خَٰلِدُونَ ٨١ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٨٢ وَإِذۡ أَخَذۡنَا
مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ
إِحۡسَانٗا وَذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَقُولُواْ
لِلنَّاسِ حُسۡنٗا وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ
تَوَلَّيۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنكُمۡ وَأَنتُم مُّعۡرِضُونَ ٨٣

١٢

﴿فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ يَكۡتُبُونَ ٱلۡكِتَٰبَ بِأَيۡدِيهِمۡ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشۡتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلٗاۖ فَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ ٧٩﴾ فەوتان وبە هیلاکداچوون بۆ ئەو کەسانەی نوسراو بە دەستی خۆیان دەنوسنەوە پاشان دەڵێن : ئەمە لە لایەن خوداوە دابەزیوە بۆ ئەوەی کەمێك پارە وسامان ودەسەڵات وناوبانگ وپلەوپایەی دونیایی پێ بەدەستبهێنن ، بە هیلاکدا بچن لەبەر ئەوەی دەیاننوسیەوە ، وبە درۆوە دەیانگوت : خودا

دایبەزاندوە ، ودیسان بە هیلاکدا بچن لەبەر ئەو پارە وسامان ودەسەڵات وپلەوپایەی لەو ڕێگایەوە بە دەستیان دەهێنا .

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ترسناکی خواردنی ماڵ وسامانی خەڵك بە نارەوا بە ناوی ئاینەوە ، یان ئەوەی ئاین وەك ئامراز بە کاربهێنرێت بۆ دەست خستنی دەسەڵات وپلە وپایە وناوبانگ ، وبەڵگەشە لەسەر بێنرخی وکەم بەهایی دونیا وهەموو خۆشیەکانی لە چاو خۆشیە نەبڕاوەکانی بەهەشت ، چونکە بوخاری لە سهلی کوڕی سعدی الساعدیەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : ڕووبەری شوێنی قامچی کەسێکتان لە بەهەشت باشترە لە هەموو دونیا وئەوەشی لەسەریەتی .

﴿وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعۡدُودَةٗۚ قُلۡ أَتَّخَذۡتُمۡ عِندَ ٱللَّهِ عَهۡدًا فَلَن يُخۡلِفَ ٱللَّهُ عَهۡدَهُۥٓۖ أَمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٨٠﴾ جوولەکەکان دەیانگوت : ئێمە ئاگر نامانسوتێنێ وسزا ناچەژین لە دۆزەخدا ، جگە لە چەند ڕۆژێکی کەم نەبێت ، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ پێیان بڵێ : ئایا ئێوە بەڵێنتان لە خودا وەرگرتووە کە ئەو قسەیە دەکەن ؟! ئەگەر بەڵێنتان لە خودا وەرگرتووە بێگومان هەرگیز خودا بەڵێنەکانی ناشکێنێت وبەجێیان دەهێنێت ؟ ، یان لە خۆتانەوە بە ناوی خوداوە قسە دەکەن ودرۆ دەکەن وهیچ زانیاریتان نییە .

جوولەکەکان لەبەر ئەوەی خۆیان بە گەلی هەڵبژێردراوی خودا دەزانن ، سەرەڕای ئەو هەموو تاوان وسەرپێچیەیان کە گوێرەکەیان پەرست ، وهەندێك لە پێغەمبەرەکانیان بە نارەوا کوشت ! دەیانگوت : بەس چەند ڕۆژێکی کەم لە ئاگردا دەمێنینەوە پاشان ڕزگارمان دەبێت ، ئەو قسەیەشیان لە خۆیانەوە دەکرد بەبێ هیچ بەڵگە وبنەمایەك ، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە قسەکردن بە ناوی خودا وئاین وپێغەمبەرەوە ﷺ تاوانێکی گەورەیە ، بوخاری ومسلم لە

ئەبوهریرەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : هەر کەس درۆ بە ناوی منەوە بکات بە ئەنقەست ئەوا شوێنی لە ئاگردا بۆ خۆی ئامادەکردووە .

﴿بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨١﴾﴾ نەخێر وانییە هەرکەس خراپەکاربێت وتاوانەکانی هێندە زۆربن لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی بدەن ، ئەوانە هاوەڵی ئاگرن بە هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە .

خودای پەروەردگار جوولەکەکان بە درۆ دەخاتەوە کە بەبێ بەڵگە دەیانگوت : ئێمە هەرچەندە تاوانباربین زۆر لە ئاگردا نامێنینەوە ، نەخێر بەڵکو هەرکەس کوفر وتاوانی ئەوەندە زۆربێت وەك تەیمان وپەرژینێك دەوری بدەن ، ئەوا بە هەتا هەتایی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە ، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دۆزەخ کۆتایی نایەت وبە هەمیشەیی بێباوەڕەکانی تێدا دەمێننەوە ، وەڵامیشە لەسەر گرۆهی جەبرییەکان کە دەڵێن : مرۆڤەکان ویست وئیرادەیان نییە ، وئەوەی ئەنجامی دەدەن ودەیڵێن پێیان دەکرێت ، چونکە خودا دەفەرموێت : هەرکەس خۆی تاوان ئەنجام بدات .

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾﴾ بەڵام ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە وبە زمانیان قسەی باش دەکەن وبە ئەندامەکانی جەستەیان کردەوەی باش ئەنجام دەدەن ئەوانە هاوەڵی بەهەشتن بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە .

ئیبن عثیمین لەسەر ئەم ئایەتە دەڵێت : باوەڕ بە تەنها بەس نییە بۆ چوونە بەهەشت ، بەڵکو پێویستە کردەوەی چاکی لەگەڵدابێت ، وهەروەها کردەوەی چاکیش بێ سودە بەبێ باوەڕ .

﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَانٗا وَذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنكُمۡ وَأَنتُم مُّعۡرِضُونَ ٨٣﴾ وئەوەش بەیاد بهێننەوە کە بەڵێن وپەیمانمان لە نەوەکانی یەعقوب وەرگرت ، کە هیچ نەپەرستن جگە لە خودا وچاکەکاربن لەگەڵ دایك وباوك وخزمەکان وهەتیوەکان وهەژارەکان ، وقسەی باش وجوان لەگەڵ خەڵکدا بکەن ونوێژەکانتان بەو شێوەی فەرمانتان پێکراوە ئەنجامبدەن ، وزەکاتی سامانەکانتان دەربکەن ، وپاشان دوای ئەوەی بەڵێن وپەیمانتاندا پاشگەزبوونەوە وپشتان هەڵکرد جگە لە هەندێکی کەمتان نەبێت .

حەسەنی بەصری دەڵێت : قسەی جوان بریتییە لە : فەرمانکردن بە چاکە ویاساغیکردنی خراپە ودانایی وسزانەدانی خەڵك وتۆڵە نەکردنەوە ولێبوردەیی ، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە نوێژ وزەکات لەسەر جوولەکەکان فەرزبووە ، لە شەریعەتدا هەتیو بە هەموو منداڵێکی کوڕ دەگوترێت : کە باوکی مردبێت ونەگەیشتبێتە تەمەنی باڵغبوون ، وکچ ئەگەر سوڕی مانگانەی بۆ نەهاتبێت ، الطبراني لە حنظلەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : دوای باڵغبوون هەتیوی نییە ، وکچ ئەگەر سوڕی مانگانەی بۆهات هەتیو نییە .

﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ لَا تَسۡفِكُونَ دِمَآءَكُمۡ وَلَا تُخۡرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ ثُمَّ أَقۡرَرۡتُمۡ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ ٨٤﴾ وئەوەش بە یاد بهێننەوە کە بەڵێن وپەیمانمان لێوەرگرتن کە خوێنی یەکتر نەڕێژن ، ویەکتر لە ماڵ وحاڵ وزێدی باوباپیرانتان دەربەدەر نەکەن ، پاشان بڕیارتاندا وخۆشتان گەواهیدەری ئەو بەڵێن وپەیمانەبوون .

﴿ثُمَّ أَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ تَقۡتُلُونَ أَنفُسَكُمۡ وَتُخۡرِجُونَ فَرِيقٗا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمۡ تَظَٰهَرُونَ عَلَيۡهِم بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَإِن يَأۡتُوكُمۡ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمۡ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيۡكُمۡ إِخۡرَاجُهُمۡۚ أَفَتُؤۡمِنُونَ بِبَعۡضِ ٱلۡكِتَٰبِ وَتَكۡفُرُونَ بِبَعۡضٖۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفۡعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ إِلَّا خِزۡيٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلۡعَذَابِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ٨٥﴾ **پاشان ئێوە** ئەو بەڵێن وپەیمانەتان نەبردەسەر ویەکتر دەکوژن وکۆمەڵێکتان لە زێد ومالّ وحالّی خۆیان دەربەدەر دەکەن ، وپشتگیری وهاوکاری ئەوانەتان دەکەن کە بە تاوان وستەم بەسەر هەندێکتاندا زاڵدەبن وسەردەکەون ، کەچی ئەگەر بە دیل گیرابان پارەتان بۆ کۆ دەکردەوە وفیدیەتان دەدا بۆ ئازادکردنیان ، لە کاتێکدا دەرکردنیان لە مالّ وحالّیان حەرامبوو لەسەرتان کە هۆکاری ئەو بە دیل گیرانەیان بوو ، ئایا ئێوە باوەڕ بە بەشێك لە کتێبەکەتان کە تەوراتە دەهێنن وبێباوەڕن بە هەندێکی تری ؟! ، بە دڵنیاییەوە پاداشتی ئەو کەسانەتان بەو شێوەیە ڕەفتار دەکەن تەنها سەرشۆڕی وڕیسواییە لە ژیانی دونیا ، ودوای زیندووبوونەوەش لە قیامەت توندترین سزا دەدرێن ، چونکە خودا بێئاگا نییە لەو کار وکردەوانەی ئەنجامی دەدەن .

الجُزْءُ الأَوَّلُ　　سُورَةُ البَقَرَةِ

وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ لَا تَسۡفِكُونَ دِمَآءَكُمۡ وَلَا تُخۡرِجُونَ
أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ ثُمَّ أَقۡرَرۡتُمۡ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ ٨٤
ثُمَّ أَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ تَقۡتُلُونَ أَنفُسَكُمۡ وَتُخۡرِجُونَ فَرِيقٗا
مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمۡ تَظَٰهَرُونَ عَلَيۡهِم بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ
وَإِن يَأۡتُوكُمۡ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمۡ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيۡكُمۡ
إِخۡرَاجُهُمۡۚ أَفَتُؤۡمِنُونَ بِبَعۡضِ ٱلۡكِتَٰبِ وَتَكۡفُرُونَ بِبَعۡضٖۚ
فَمَا جَزَآءُ مَن يَفۡعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ إِلَّا خِزۡيٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَاۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلۡعَذَابِۗ وَمَا ٱللَّهُ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ٨٥ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡحَيَوٰةَ
ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ
٨٦ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَقَفَّيۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ
بِٱلرُّسُلِۖ وَءَاتَيۡنَا عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدۡنَٰهُ بِرُوحِ
ٱلۡقُدُسِۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمۡ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهۡوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ
ٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ فَفَرِيقٗا كَذَّبۡتُمۡ وَفَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ ٨٧ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا
غُلۡفُۢۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَقَلِيلٗا مَّا يُؤۡمِنُونَ ٨٨

١٣

خودای پەروەردگار لە تەوراتدا لەسەر جوولەکەکان کوشتنی حەرام کردبوو ، وپێویستی کردبوو گەر لەگەڵ دوژمندا شەڕیان کرد ، ولێیان بە دیل گیرا فیدیەی بۆ بدەن وئازادی بکەن ، بەڵام جوولەکەکانی مەدینە لە پێش کۆچی پێغەمبەر ﷺ دوو بەرەبوون (بنو قینقاع) کە هاوپەیمانی خەزرەجییەکان بوون ، بەڵام (بنو قریظه وبنو نظیر) کە هاوپەیمانی ئەوسییەکان بوون ، هەردوو هۆزی ئەوس وخەزرەج لەسەردەمی نەفامیدا لەگەڵ یەك شەڕیان بکردابایە جوولەکەکان لە دژی یەك شەڕیان دەکرد ، هەر لایەك هاوپەیمانەکەی خۆی سەردەخست کە بتپەرست وهاوبەش بڕیاردەربوون ولە یەکتریان دەکوشت بەڵام دوای کۆتایی هاتنی شەڕەکە (بنو قینقاع) فیدیەی دەدا بە ئەوسییەکان بۆ ئازادکردنی ئەو جوولەکانەی بە دیل گیرابوون لە (بنو قریظه وبنو نظیر) ، وهەروەها (بنو قریظه وبنو نظیر) فیدیەیان دەدا بە خەزرەجییەکان بۆ ئازادکردنی ئەو جوولەکانەی بە دیل گیرابوون لە (بنو قینقاع) ئەمەشیان بە پەیڕەوکردن لە تەورات لێکدەدایەوە ، بەڵام خودای پەروەردگار لۆمەی کردن کە چۆن دەبێت باوەڕتان بە هەندێك لە ئایەتەکانی تەورات هەبێت وپەیڕەوی بکەن وسەرپێچی هەندێکی تری بکەن ، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نابێت ئاین پارچە پارچە بکرێت وپەیڕەوی لە هەندێکی بکرێت وهەندێکی پشتگوێ بخرێت بەڵکو پێویستە هەموو ئەوەی خودای پەروەردگار یاساغیکردووە موسڵمانان لێی دوورکەونەوە وهەموو ئەوەشی فەرمانیان پێکراوە پەیڕەوی لێبکەن خودا ﷻ دەفەرمویێت : ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ۝٧﴾(الحَشْرِ) ، وبوخاری ومسلم لە ئەبوهریرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەری خودابوو دەیفەرموو ﷺ ئەوەی یاساغیم کردووە لێتان لێی دوورکەونەوە ، وئەوەی فەرمانم پێکردوون ئەنجامی بدەن بە گوێرەی تواناتان .

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُاْ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْـَٔاخِرَةِۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾﴾ ئەوانە ژیانی دونیایان بە دوارِۆژیان کرِی وخۆشی کەمی دونیایاندا بەسەر قیامەتیاندا ، بە هیچ شێوەیەك وبۆ کاتێکی کەمیش سزایان لەسەر سووك ناکرێت وکەسیش نییە سەریان بخات وفریاد رِەسیان بێت ولە سزای خودا بیانپارێزێت .

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِۖ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾﴾ بێگومان کتێبمان بە پێغەمبەر موسا عليه السلام بەخشی کە تەورات بوو ، ودوای ئەو کۆمەڵە پێغەمبەرێکمان رِەوانەکرد لە نەوەکانی یەعقوب ، وکۆمەڵە بەڵگە ونیشانەیەکمان بەخشیە عیسای کورِی مەریەم عليه السلام وبە هێزمان کرد ویارمەتیماندا بە جبریل عليه السلام ، ئەوە چییە هەرکات پێغەمبەرێك رِەوانە بکەین کە شەریعەت وبەرنامەکەی لەگەڵ حەز وئارەزووی ئێوەدا نەیەتەوە خۆتان بە زلدەزانن ولوت بەرزی دەکەن ، کۆمەڵە پێغەمبەرێکتان لە رِابردوو بە درۆخستنەوە وکۆمەڵێکیان لێ دەکوژن .

پەیامی خودا بۆ مرۆڤەکان کتێبەکانیەتی کە بە پێغەمبەرەکانیدا رِەوانەی کردووە کە گەورەترینیان قورئانە ، کە گەورەترین نیعمەتە بۆ رِێکخستنی ژیانی دونیا وبە دەستهێنانی بەهەشتی نەبرِاوەش ، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە هەرکەس باوکی نەبوو دەدرێتە پاڵ دایکی ، وپێغەمبەر عیسا عليه السلام خودا کۆمەڵە بەڵگە ونیشانەیەکی گەورەی پێبەخشیبوو وەك : زیندووکردنەوەی مردوو ، وچاك کردنەوەی چاوی کوێر ، کە شایستەی ئەوە بوو هەموویان بە بینینی باوەرِی پێبهێنن ، بەڵام لەبەر ئەوەی پێچەوانەی حەز وئارەزوویان بوو پشتیان هەڵکرد ، هەندێك لە زانایان دەڵێن : خودای پەروەردگار بە فرمانی رِانەبردوو دەفەرموێت کۆمەڵێکیان

لیٚ دەکوژن چونکە دوای پێغەمبەر موسا عليه السلام هەوڵی کوشتنی عیسایاندا عليه السلام وخودا ڕزگاریکرد لە دەستیان وبەرزی کردەوە بۆ لای خۆی ، وهەوڵی کوشتنی پێغەمبەری ئیسلام محمدیاندا ﷺ بەوەی کە جادوویان لێکرد وژەهریان کردە خواردنەوە کە بووە هۆکارێکی مردنەکەی ، بوخاری بە موعەلەقی لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە رضي الله عنها ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ لەو نەخۆشیەی کە وەفاتی کرد دەیفەرموو : تا ئێستا هەست بە ئازاری ئەو خواردنە دەکەم کە لە خەیبەر خواردم ، ئێستا هەست دەکەم کاتی پچڕانی ئەو دەمارەی خوێنمە کە بە دڵمەوە بەستراوە بە هۆی ئەو ژەهرەوە ، لەبەر ئەوە دەڵێن : پێغەمبەری خودا ﷺ بە شەهیدی وەفاتی کردووە .

﴿وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾﴾ دەیانگوت : ئێمە دڵمان پەردەی بەسەرەوەیە وداپۆشیووە وداخراوە ئەوەی باسی دەکەیت ئەی محمد ﷺ ، ناچێتە دڵمانەوە بۆیە باوەڕ بە تۆ ناهێنین .

نەخێر بەڵکو خودا نەفرەتی لێکردوون لەبەر بێباوەڕییان ولە ڕەحم وبەزەیی خۆی بێبەشی کردوون ، باوەڕیان لاوازە یان هەر باوەڕیان نییە وبێباوەڕییان تێدا زاڵە .

﴿وَلَمَّا جَآءَهُمۡ كِتَٰبٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٞ لِّمَا مَعَهُمۡ وَكَانُواْ مِن قَبۡلُ يَسۡتَفۡتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦۚ فَلَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٨٩﴾

وکاتێك کتێبیان بۆ هات لە لایەن خوداوە کە قورئانە وئەوەی لە تەوراتدا هاتبوو پشتڕاستی دەکاتەوە ودەیسەلمێنێ ، پێش ئەوەی دەرکەوێت پێغەمبەری خودا ﷺ لە نەوەکانی یەعقوب نییە هەڕەشەیان لە بێباوەڕەکان دەکرد بەوەی شوێنی دەکەون ، وبە هۆیەوە سەردەکەون بەسەریاندا ، کاتێك پێغەمبەر ﷺ ڕەوانەکرا وناسیانەوە ، چونکە لە کتێبەکانیاندا بە ناو وسیفەتەکانی باسکرابوو باوەڕیان پێنەهێنا ، نەفرەتی خودا لە بێباوەڕان بێت .

الجزء الأول — سورة البقرة

وَلَمَّا جَآءَهُمۡ كِتَٰبٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٞ لِّمَا مَعَهُمۡ وَكَانُواْ مِن قَبۡلُ يَسۡتَفۡتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦۚ فَلَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٨٩ بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ أَن يَكۡفُرُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغۡيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٖۚ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٩٠ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ نُؤۡمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا وَيَكۡفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَهُمۡۗ قُلۡ فَلِمَ تَقۡتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبۡلُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٩١ ۞وَلَقَدۡ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ٩٢ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱسۡمَعُواْۖ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا وَأُشۡرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡعِجۡلَ بِكُفۡرِهِمۡۚ قُلۡ بِئۡسَمَا يَأۡمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٩٣



١٤

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە قورئان بۆ هەمووانە ، چونکە بە جوولەکەکان دەفەرموێت : کتێبیان بۆ هات ، وئایا ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر دروستی نەفرەت کردن بە ڕەهایی ؟ بێگومان نەفرەت کردن لە باوەڕدار دروست نییە ، چونکە بوخاری ومسلم لە ثابتی کوڕی الضحاکەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : نەفرەت کردن لە باوەڕدار وەك کوشتنی وایە ، بەڵام نەفرەت کردن لە کردەوەیەك یا سیفەتێك ئەگەرچی موسڵمانیش ئەنجامی بدات دروستە بە ڕەهایی ، ئەحمەد لە ئیبن مسعودەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی

كردووه وئەلبانی به صەحیحی داناوه ، دەڵێت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : نەفرەتی خودا لەو كەسە بێت ڕیبا دەخوات ، بەڵام ئایا دروستە لە بێباوەڕان نەفرەت بكرێت ؟ بە شێوەیەكی گشتی دروستە وەك ئەم ئایەتە وچەندان ئایەت وفەرمووده بەڵگەن لەسەری ، بەڵام نەفرەت كردن بە دیاریكراوی لە بێباوەڕان زانایان ناكۆكن لەسەری : بوخاری لە ئیبن عومەرەوه رضي الله عنهما ڕیوایەتی كردووه دەڵێت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : خودایە نەفرەت بكە لە فلان وفلان خودای پەروەردگار ئەو ئایەتەی دابەزاند : ﴿لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ أَوۡ يُعَذِّبَهُمۡ فَإِنَّهُمۡ ظَٰلِمُونَ ١٢٨﴾(آلِ عِمۡرَانَ) ، وهەروەها لە مردوی بێباوەڕانیش نابێت نەفرەت بكرێت چونكە بوخاری لە عائیشەی دایكی باوەڕدارانەوه رضي الله عنها ڕیوایەتی كردووه دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : جنێو بە مردووەكان مەڵێن چونكە گەڕاونەتەوه بۆ لای پەروەردگاریان ، وپاداشتی ئەو كردەوانە وەردەگرنەوه كە پێش خۆیان خستووه ، الطبری لە عاصمی كوڕی عومەری ئەنصارییەوه ڕیوایەتیكردوه مقبل الوادعی به حەسەنی داناوه ، دەڵێت : پیاوه بە تەمەنەكانی پشتیوانان دەیانگووت : سوێند بە خودا ئەم ئایەتە لەسەر پشتیوانان وجوولەكەكان دابەزیوه كە دراوسێیان بوون ، وتیان ئێمە چەندین ساڵ سەردەكەوتین بەسەر جوولەكەكاندا لەو سەردەمەی كە هاوبەش بڕیاردەربووین ، وئەوان خاوەن كتێب بوون ، جوولەكەكان دەیانگوت : پێغەمبەرێك كاتی هاتنی نزیكبووەتەوه شوێنی دەكەوین دەتان كوژین ولە ناوتان دەبەین ، وەك كوشتنی عاد وئیرەم ، كاتێك خودای پەروەردگار پێغەمبەری لە هۆزی قوڕەیش هەڵبژارد ، وئێمە باوەڕمان پێهێنا وشوێنیكەوتین وجوولەكەكان باوەڕیان نەهێنا خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿وَلَمَّا جَآءَهُمۡ كِتَٰبٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٞ لِّمَا مَعَهُمۡ وَكَانُواْ مِن قَبۡلُ يَسۡتَفۡتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦۚ فَلَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٨٩﴾ .

﴿بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ۚ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩٠﴾﴾ خراپیانکرد بێباوەڕیان هەڵبژارد بۆ نەفسی خۆیان وبە باوەڕ گۆڕییانەوە وباوەڕیان نەهێنا بەوەی کە خودا دایبەزاندووە کە قورئانە ، لەبەر ستەم وئێرەیی بردنیان پێیان ناخۆشبوو خودا لە فەزڵی خۆی کتێبەکەی دادەبەزێنێت بۆ هەرکەس لە بەندەکانی کاتێ بیەوێت کە مەبەستی پێغەمبەری خودایە ﷺ ، سەرەنجام تووشی توڕەبوونی لەسەر یەکی خودابوونەوە ، وبێباوەڕەکان سزای سەختی ڕیسواکەریان بۆ هەیە .

زانایان چەند ڕایەکیان هەیە لە ڕاڤەی ﴿بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ﴾ ئەبوالعالیە دەڵێت : خودا توڕەبوو لێیان لەبەر ئەوەی باوەڕیان بە ئینجیل وعیسای پێغەمبەر عليه السلام نەهێنا ، پاشان توڕەبوو لێیان لەبەر ئەوەی باوەڕیان بە قورئان ومحمدی پێغەمبەر ﷺ نەهێنا ، وئیبن عباس رضي الله عنهما والسدی دەڵێن : توڕەبوونی یەکەم ئەو کاتەبوو کە گوێرەکەکەیان پەرست ، وتوڕەبوونی دووەم لەسەر ئەوە بوو باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەری خودا ﷺ .

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ ۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾﴾ ئەگەر بە جوولەکەکان بگوترایە : باوەڕبهێنن وملکەچی ئەوەبن کە خودا دایبەزاندووە کە قورئانە دەیانگوت : باوەڕدارین بەوەی لەسەرمان دابەزیوە کە تەوراتە وجگە لەوە باوەڕ بە هیچی تر ناهێنین ، لە کاتێکدا قورئان حەقە وسەلماندوویەتی ئەوەی لە کتێبەکەی ئەواندا هاتووە کە تەوراتە ، ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ : ئەی بۆچی پێغەمبەرانی خوداتان دەکوشت لەوەوپێش ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن باوەڕدارن ؟.

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە هەرکەس حەقی بۆ باسبکرێت وملکەچی نەبێت ، یان بیزانێت وکردەوەی پێنەکات لەو سیفەتەدا هاوشێوەی جوولەکە کەلـلـەڕەقەکانە کە حەقیان بۆ باسدەکرا وپشتیان هەڵدەکرد ، ودەیانزانی ئیسلام وپێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاستن وباوەڕیان نەهێنا ، وئەوەشی تێدایە نابێت مرۆڤ بانگەشەی شتێك بکات ولە واقیعدا باوەڕی وانەبێت وکردەوە پێچەوانەی بیروباوەڕی بکات ، وخستنەڕووی بەڵگەی بەهێزی تێدایە لە کات وساتی پێویستدا بۆ دەمکوتکردنی نەیارانی ڕێگای ڕاست .

﴿۞وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾﴾ بێگومان پێغەمبەر موسا ﷷ کۆمەڵێك بەڵگە ونیشانەی حاشا هەڵنەگری بۆ هێنان ، پاشان ئێوە گوێرەکەکەتان پەرست دوای ئەوەی خودا بانگی کرد بۆ کێوی طور ، وستەمکاربوون بەوەی هاوبەشتان بۆ خودا بڕیاردا .

ئەو گوێرەکەیەی کە نەوەکانی یەعقوب پەرستیان گیانلەبەر نەبوو بەڵکو پەیکەرێك بوو سامری لە خشڵ دروستی کردبوو وکونی تێکردبوو کە هەوای پێدا تێدەپەڕی دەنگێکی وەك دەنگی مانگای دەردەکرد ، دوای ئەوەی پێغەمبەر موسا ﷷ چل ڕۆژی پێچوو نەگەڕایەوە ، سامری وتی : ئەم گوێرەکەیە خودای ئێوە وموساشە ! ئەو پەروەردگاری خۆی نەدۆزیوەتەوە وڕێگەی هەڵەکردووە ؟! چونکە بڕیاربوو موسا ﷷ دوای سی ڕۆژ بگەڕێتەوە ، بەڵام پەروەردگار بەڵێنەکەی بۆ کردە چل ڕۆژ ، لەبەر گەمژەییان باوەڕیان بە سامری کرد وگوێرەکەکەیان پەرست ! : ﴿فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ فَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ ﴿٨٨﴾﴾(طه) .

﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱسۡمَعُواْۖ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا وَأُشۡرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡعِجۡلَ بِكُفۡرِهِمۡۚ قُلۡ بِئۡسَمَا يَأۡمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٩٣﴾﴾ وئەوەشیان بەیاد بهێننەوە کە بەڵێن وپەیمانمان لێوەرگرتن وکێوی طورمان بەرزکردەوە وەك سێبەر بەسەرتانەوە ڕامانگرت ، ئەوەی پێمان بەخشیون بە توندی دەستی پێوەبگرن ، وسستی وتەمبەڵی مەکەن وملکەچ وفەرمانبەرداربن ، وتیان : بیستمان ئەوەی بۆمان هات ، وبەڵام ملکەچ وگوێڕایەڵ نابین ، چونکە خۆشەویستی گوێرەکەکە چووبووە ناخی دڵیانەوە ! لەبەر بێباوەڕییان بەوەی پێغەمبەر موسا ﷺ لە خوداوە بۆی هێنابوون ، ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ : ئەوە چ باوەڕێکی خراپە کە فەرمانتان پێدەکات بە پەرستنی گوێرەکەیەك ؟! ، وهەست بەو خراپیە دەکەن گەر باوەڕداری ڕاستەقینەبن .

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە کردار وباوەڕی خراپ سەردەکێشێت بۆ بێباوەڕی وسەرپێچی فەرمانەکانی خودا ، وخۆشویستنی خراپ وحەز وئارەزوو سنورنەدراو بە سنورەکانی شەرع مرۆڤ لە ئاستی حەق کوێر وکەڕ دەکات ، وبە پێچەوانەوە باوەڕی ڕاستەقینە یارمەتیدەردەبێت بۆ گوێڕایەڵی وخوداپەرستی زیاتر .

﴿قُلۡ إِن كَانَتۡ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةٗ مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ : ئەگەر مەنزڵگەی دوارِۆژ وبەهەشت لای خودا ﷻ تەنها بۆ ئێوە تایبەتکراوە وبۆ خەڵکی تر نییە ، کەواتە خۆزگە بخوازن کە بمرن بۆ ئەوەی بچنە بەهەشتەوە ئەگەر ڕاست دەکەن .

﴿وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾﴾ بەلاّم هەرگیز ئەو خۆزگەیە بە مردن ناخوازن لەبەر ئەو کردەوە چەپەلاّنەی کە بە دەستیان ئەنجامیانداوە وپێشی خۆیان خستووە ، وخودا زانایە بەکردەوەی ستەمکاران .

لێرە دەفەرموێت : بە دەستیان ئەنجامیانداوە چونکە دەست زۆرێك لە تاوان وخراپەکانی پێ ئەنجام دەدرێت وەك دزی وستەم ، بوخاری ومسلم لە عبداللە کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : موسڵمانی باش ئەوەیە کە موسڵمانان لە دەم ودەستی سەلامەتبن ، ولە ڕیوایەتی مسلم دا هاتووە : پیاوێك پرسیاریکرد باشترین موسڵمان کێیە ؟ فەرمووی : باشترین موسڵمان ئەو موسڵمانەیە کە موسڵمانان لە دەم ودەستی سەلامەتبن .

الجُزْءُ الأَوَّلُ　　سُورَةُ البَقَرَةِ

قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن
دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَن
يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ
﴿٩٥﴾ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ۚ
يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ
ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قُلْ مَن
كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ
ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ
﴿٩٧﴾ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ
وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ
إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾
أَوَكُلَّمَا عَٰهَدُوا۟ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُمۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ
لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ
لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ
كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾

١٥

﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾﴾ بێگومان دەیانبینی نەك هەر خۆزگە بە مردن ناخوازن ، بەڵکو لە هەموو خەڵك زیاتر پەرۆشترن بۆ ژیان ولەو هاوبەش بڕیاردەرانەی کە باوەڕیان بە ژیانی دوارۆژ نییە زیاتر حەزیان لە مانەوە وژیانی دونیایە ،

هەریەکەیان حەزدەکات وئاواتەخوازە هەزارساڵ بژی ، ئەگەر ئەو خۆزگەیەشی بەدیبێت ڕزگاری نابێت لە ئاگری دۆزەخ ولێی دوورناکەوێتەوە ، وخودا بینەری هەموو ئەو کردەوانەیە کە ئەنجامی دەدەن .

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە جوولەکە زۆر حەز بە ژیانی دونیا دەکەن بە هەرچی جۆرێك بێت ، وهەرکەس زۆر وابەستەی دونیابێت حەز بە مردن ناکات ، وتەمەن درێژی ئەگەر لەسەر سوننەت وهیدایەت نەبێت سودی نییە وخاوەنەکەی لە ئاگری دۆزەخ دوور ناخاتەوە .

﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بفەرموو : هەرکەس دژایەتی جبریل بکات عليه السلام بێهودەیە وتەنها لەبەر ئەوەیە کە قورئانی دابەزاندوە بۆ سەر دڵی تۆ بە ویستی خودا کە سەلمێنەری کتێبەکانی پێش خۆیەتی وەك تەورات وئینجیل وڕێنمایی وبەڵگە ومژدەی تێدایە بۆ باوەڕداران .

﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾﴾ هەرکەس دژایەتی خودا ، وفریشتەکانی خودا ، وپێغەمبەرەکانی خودا ، وجبریل ومیکائیل بکات ، ئەوە بە دڵنیاییەوە خودا دوژمنی بێباوەڕانە .

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە باوەڕ نەبوون بە یەکێك لە پێغەمبەرانی خودا خاوەنەکەی بێباوەڕدەکات ، وهەر کەس بێباوەڕبێت خودا دوژمنیەتی ، ئەحمەد والنسائی والترمذی لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : جوولەکەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ وتیان : ئەی ئەبوالقاسم پرسیارت لێدەکەین دەربارەی کۆمەڵە شتێك ئەگەر وەڵامت داینەوە شوێنت دەکەوین وبەڕاستت دادەنێین وباوەڕت پێدەهێنین ، دەڵێت

: بەڵێنی لێوەرگرتن وەك ئەو بەڵێنەی یەعقوب ﷺ لە کوڕەکانی وەرگرت ، کاتێك وتیان : ﴿ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٦٦﴾﴾(یُوسُف) ، وتیان : هەواڵمان بدەریٚ دەربارەی نیشانەی پێغەمبەر ﷺ ؟ ، فەرمووی : چاوەکانی دەنوێت ودڵی نانوێت ، وتیان : منداڵ لە سکی دایکیدا چۆن دەبێت بە کچ وچۆن دەبێت بە کوڕ ؟ ، فەرمووی : کاتێك ئاوی ژن وپیاو بە یەك دەگەن ، ئەگەر ئاوی ژنەکەی سەر ئاوی پیاوەکە کەوت منداڵەکە کچ دەبێت ، وئەگەر ئاوی پیاوەکە سەر کەوت کوڕ دەبێت ، وتیان : ڕاستت فەرموو ، وتیان : هەواڵمان بدەریٚ دەربارەی هەورە بروسکە چییە ؟ فەرمووی : فریشتەیەکە لە فریشتەکانی خودا ڕاسپێردراوە بە هەور ، ودەسماڵی ئاگرینی پێیە هەورەکانی پیٚ دەجولێنێت بۆ هەر شوێنێك خودا بیەوێت ، وتیان : ئەی ئەو دەنگە چییە لێوەی دەبیسترێت ، فەرمووی : خوڕینی فریشتەکەیە کاتێك لە هەورەکان دەخوڕێت ، هەتا دەگاتە ئەو شوێنەی کە فەرمانی پێکراوە ، وتیان : ڕاستت فەرموو ، وتیان پێمان بڵیٚ : یەعقوب چی لەسەر نەفسی خۆی حەرام کردبوو ، فەرمووی : لە بیابان نیشتەجیٚ بوو ، تووشی نەخۆشی پشت ئێشە (عرق النسا) بوو نەزری کردبوو ئەگەر خودا ئەو نەخۆشییەی لەسەر لا ببات وازدەهێنێت لە خۆشترین خواردن وخواردنەوەی کە گۆشتی حوشتر وشیرەکەی بوو لەبەر ئەوە لەسەر خۆی حەرامیکرد ، وتیان : ڕاستت فەرموو ، وتیان پێمان بڵیٚ کام لە فریشتەکان سروشت بۆ دەهێنێت چونکە هیچ پێغەمبەرێك نییە فریشتە سروشی بۆ نەهێنێت لە لایەن خوداوە ، کێیە هاوەڵەکەت هیچت نەهێشتەوە تەنها ئەمە ماوە گەر وەڵامان بدەیتەوە شوێنت دەکەوین ؟ فەرمووی : جبریل ﷺ ، وتیان ئەوە شەڕ وکوشتار دادەبەزێنێت ، ئەگەر وەڵامەکەت : میکائیل بووایە کە باران وڕەحمەت دادەبەزێنێت شوێنت دەکەوتین ، خودای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾﴾ .

﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾﴾ بێگومان ئێمە کۆمەڵە بەڵگە ونیشانەیەکمان بۆ دابەزاندویت ، هیچ کەس بێباوەڕ نابێت پێیان ، جگە لە کەسانی لاڕێ وتاوانبار .

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان لە بەرزییەوە دابەزییوە ، وفاسقیش دوو جۆرە : جۆرێکیان خاوەنەکەی لە ئاین دەردەکات وەك ئەمەی لێرە باسکراوە وپێی دەگوترێت فیسقی گەورە ، ودووەمیان : خاوەنەکەی تاوانبارە ولە ئاین پێی دەرناچێت .

﴿أَوَكُلَّمَا عَـٰهَدُوا۟ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾﴾ جوولەکەکان هەرکات بەڵێن وپەیمانێکیان دەدا کۆمەڵێکیان پشتگوێیان دەخست وپەیمان شکێنیان دەکرد ، بەڵکو زۆربەیان باوەڕناهێنن .

﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ كِتَـٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾﴾ وکاتێك پێغەمبەریان بۆ ڕەوانەکرا کە محمد بوو ﷺ لە لایەن خوداوە کە سەلمێنەری ئەو ڕاستیە بوو کە لە تەوراتدا هاتبوو ، کۆمەڵێك لە جوولەکەکان کە بریتی بوون لە زانا وحاخامەکانیان تەوراتیان پشتگوێ خست کە مژدەی هاتنی کۆتا پێغەمبەری تێدابوو ، وخۆیان لێ گێل کرد وەك ئەوەی هەواڵی ئەو بابەتەیان هەر نەزانیبێت ونەبیستبێت .

وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْۚ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِي ٱلْأٓخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْۚ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌۖ لَّوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرْنَا وَٱسْمَعُواْۗ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْۗ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾



ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەری ئیسلام بۆ هەموو مرۆڤایەتی ڕەوانەکراوە وتایبەت نییە بەگەل ونیشتیمان ونەتەوەیەك ، وهەروەها خراپی شکاندنی بەڵێن وپەیمانی تێدایە ، ئەگەر کەسێك وەفادار نەبێت وبەڵێنەکانی نەباتە سەر دوو خراپەی کۆ کردووەتەوە ، یەکەمیان : نیشانەیەکی دووڕووی تێدایە ، ودووەمیان : هاوشێوەی جوولەکەکانە لەو سیفەتەیدا ، وخراپی شاردنەوەی زانستی شەرعی لە کاتێکدا کە پێویست بە دەرخستنی بکات ، خودا دەفەرموێت : ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْاْ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًاۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾﴾(آلِ عِمْرَانَ) ، وئەحمەد وئەبوداود والنسائی وئیبن ماجە لە ئەبوهریرەوە رضي الله عنه ریوایەتیان کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم خودا فەرمووی : هەرکەس پرسیاری زانستی لێبکرێت وبیشارێتەوە خودا لەغاوی دەکات بە لەغاوێکی ئاگرین لە ڕۆژی قیامەتدا .

﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ

مِنۡ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا تَكۡفُرۡۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنۡهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَزَوۡجِهِۦۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنۡ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡۚ وَلَقَدۡ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشۡتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖۚ وَلَبِئۡسَ مَا شَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ جوولەکەکان شوێنی ئەو جادووە کەوتن کە شەیتانەکان بە درۆوە هەڵیان دەبەست لەسەردەمی دەسەڵاتی پێغەمبەر سلیمان ﷺ ، وپێغەمبەر سلیمان ﷺ بێباوەڕ نەبوو بەڵکو شەیتانەکان بێباوەڕبوون کە جادوویان فێری خەڵك دەکرد ، وهەروەها شوێنی ئەو جۆرە لە جادوو کەوتن کە دابەزێنرابوو بۆ هەردوو فریشتەی هاروت وماروت کە لە شاری بابل بوون لە وڵاتی عێراق ، جا ئەو دوو فریشتەیە کەسیان فێر نەدەکرد هەتاکو پێیان دەگوت : ئەمەی ئێمە بۆ تاقیکردنەوەیە بۆ ئەوەی دەرکەوێت کێ جادووی دەوێت وکێ نایەوێت ، بۆیە بێباوەڕ مەبە بە فێربوونی جادوو ، بەڵام ئامۆژگارییان وەرنەگرت وفێری جادووی لەبەر چاوخستن بوون ، کە بە هۆیەوە ناکۆکیان دەخستە نێوان پیاو وژنەکەی ولەیەکیان جیا دەکردنەوە ، ونەیان دەتوانی زیان بەکەس بگەیەنن بەبێ ویستی خودا ، بێگومان لەو دوو فریشتەوە فێری جادوو بوون وئامۆژگارییان وەرنەگرت کە زیانیان پێدەگەیەنێت وهیچ سودیان پێناگەیەنێت ، بێگومان ئەوانەی هەوڵی فێربوونی جادوویان دەدا دەیانزانی لە قیامەتدا هیچ پاداشتیان بەباشە نادرێتەوە لەسەری ، بێگومان نەفسی خۆیان بە شتێکی خراپ فرۆشت ودۆڕاندیان ، ئەو زانستەی هەیان بوو گەر زانستێکی سودبەخش بووایە خۆیان فێری جادوو نەدەکرد .

النسائی لە "التفسیر"دا لە ئیبن عباسەوە رضي الله عنهما ریوایەتی کردووە وئەحمەد شاکر بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : ئاصف نوسەری سلێمان کوڕی داود بوو ، و"الاسم الأعظم"ی دەزانی ، هەموو شتێکی دەنووسی کە سلیمان ﷺ فەرمانی پێدەکرد ولە ژێر کورسییەکەی سلیمان دەیشاردەوە ، کاتێك سلیمان ﷺ وەفاتی کرد شەیتانەکان دەریان هێنا ، لە نێوان هەموو

دێڕەکانیدا جادوو ودرۆ وکوفریان نوسی ، ووتیان : ئەمە ئەو شتانە بوو کە سلیمان کردەوەی پێدەکرد ، خەڵکە نەفام وگەمژەکە کافریان کرد وجنێویان پێدا ، وزاناکانیان وەستان وبێدەنگیان هەڵبژارد ، بەردەوام نەفامەکان جنێویان پێدەدا ، هەتا خودا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ﴾ ، والطبری لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە وئیبن حجر بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : سلیمان عليه السلام هەرچی جادووە کۆیکردەوە ولە ژێر کورسییەکەی شاردییەوە ، وهیچ کەس لە شەیتانەکان نەیان دەتوانی لە کورسییەکە نزیك ببنەوە ، کاتێك سلێمان عليه السلام وەفاتی کرد ، وهەروەها ئەو زانایانەش وەفاتیان کرد کە زانستی ئاینیان هەبوو ، شەیتانێك لە وێنەی مرۆڤدا چوو بۆ لای جوولەکەکان وپێی گوتن : ئایا گەنجینەیەکی بێ وێنەتان پیشان نەدەم ؟ وتیان : بەڵێ ، وتی : ژێر کورسییەکەی سلێمان عليه السلام چاڵ بکەن ، دەستیان بە چاڵ هەڵکەندن کرد ، شەیتانەکە لێیان دوورکەوتەوە ، ئەو نوسراوانەیان دۆزییەوە ، پێی گوتن : سلیمان عليه السلام بەمە مرۆڤ وجنی بەڕێوە دەبرد ! ، ئیدی لە نێویاندا بڵاوبوویەوە کە سلیمان عليه السلام جادووگەر بووە ، کاتێك قورئان ناوی سلیمانی عليه السلام لە ڕیزی پێغەمبەراندا هێنا ، جوولەکە نکوڵی ئەوەیان کرد ، وتیان : بێگومان سلیمان جادووگەر بووە ، خودا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند ؛ زانایان ناکۆکن لەسەر تەفسیری ئەم ئایەتە ، هەندێکیان دەڵێن : هاروت وماروت دوو پادشای جادووگەر بوون ، وهەندێك دەڵێن (ما) نەفییە واتە : جادوو بۆ دوو فریشتەکە دانەزیوە ، بەڵام زۆربەی زانایانی پێشین ئەوە بە پەسەند دەزانن کە دوو فریشتەبوون خودا وەك تاقیکردنەوە داییەزاندونەتە سەر زەوی ، ئەم ئایەتە چەند بەڵگەیەکی تێدایە کە جوولەکە جادوویان لە شەیتانەکانەوە وەرگرت ، وئەو جادووەی کە شەیتانەکان فێری مرۆڤی دەکەن خاوەنەکەی بێباوەڕ دەکات ، ودونیا جێگەی تاقیکردنەوەیە خودا ﷻ بە چ هۆکارێك بیەوێت بەندەکانی تاقیدەکاتەوە ، وهیچ شتێك ناتوانێ زیان بە مرۆڤ بگەیەنێت بەبێ ویستی خودا ، وجیاکردنەوەی ژن ومێرد لەیەکتر تاوانێکی

گەورەیە ، ئەبوداود والنسائی لە "السنن الكبرى" وحاكم لە ئەبوهریرەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : پێغەمبەری ﷺ خودا فەرمووی : هەرکەس فێڵ لە ژنێك بکات ولە پیاوەکەی هەڵیگەڕێنێتەوە ولەبەرچاوی بخات لە ئێمە نییە ، ئیبن کثیر دەڵێت : ئەوەی دەربارەی سەرگوزەشتەی هاروت وماروت هاتووە لە نەوەکانی یەعقوبەوە گێڕراوەتەوە ، وهیچ فەرموودەیەکی صەحیح لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ نەهاتووە دەربارەیان وقورئان بە کورتی باسیکردوە ودرێژەی پێنەداوە ، وئێمە باوەڕمان بەوە هەیە کە لە قورئاندا هاتووە ، بەو شێوەیەی کە خودا مەبەستییەتی .

﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾﴾ بەڵام ئەگەر جوولەکەکان باوەڕیان بهێنایە وکردەوەی باشیان ئەنجامبدایە وپارێزکاربوونایە ئەو پاداشتەی لای خودا ﷻ بە دەستیان دەهێنا زۆر باشتر بوو بۆیان ئەگەر نەفام نەبوونایە وبیانزانیبایە .

مرۆڤی موسڵمانی شارەزا هەرچی خۆشی وپلە وپایەی دونیایە نایگۆڕێتەوە بە قیامەتی ، چونکە دەزانێت ژیانی دونیا بە بەراورد بە ژیانی نەبڕاوەی هەتا هەتایی قیامەت شتێکی کەم وڕابواردن وخۆشییەکی کاتییە ، وەك بوخاری لە سەهل کوڕی سعدی الساعدیەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : ڕووبەری شوێنی قامچی کەسێکتان لە بەهەشت باشترە لە هەموو دونیا وئەوەشی لەسەریەتی .

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرْنَا وَٱسْمَعُواْ ۗ وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾﴾ ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە کاتێك گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ دەکەن مەڵێن : ﴿رَٰعِنَا﴾ بەڵکو بڵێن : ﴿ٱنظُرْنَا﴾ وگوێ ڕایەڵبن ، وبۆ جوولەکە وبێباوەڕەکان سزایەکی سەختی بە ئازار هەیە .

موسڵمانان کاتێك گفتوگۆیان لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ دەکرد دەیانگوت : گوێمان بۆ بگرە ڕەچاوی حاڵمان بکە ، بەڵام جوولەکەکان وشەی (راعنا)یان بە مانای گێلی وگەمژەیی بەکار دەهێنا ، لەبەر ئەوە خودا ﷻ قەدەغەیکرد لە موسڵمانان ئەو وشەیە بەکاربهێنن وپێی فەرموون ، بڵێن : چاوەڕوانمان بکە ولەسەرمان بوەستە ، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە باوەڕداران دەبێت وشەی ڕوون وئاشکرا بەکاربهێنن ونابێت وشە وزاراوە گەلێك بە کاربهێنن کە لە هەمان کاتدا مانای باش وخراپیش لە خۆ بگرێت ، وئەوەی ئەگەر شتێکی حەڵاڵ ئامرازبوو بۆ کەوتنە حەرامێکەوە ئامرازەکەش حەرام دەبێت چونکە وەك لە ڕێسا فقهیەکاندا هاتووە دەڵێن : ئامرازەکان حوکمی مەبەستەکانیان هەیە ، وهەروەها ڕێگە گرتن لە هەندێك حەڵاڵ لە ترسی تووشبوون بە حەرام ، ورەچاوکردنی ئەدەب لەکاتی قسەکردن لەگەڵ بەرامبەردا بە تایبەت لەگەڵ زانایان ، چونکە میراتگری پێغەمبەرانن .

﴿مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَلَا ٱلۡمُشۡرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ خَيۡرٖ مِّن رَّبِّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ١٠٥﴾ بێباوەڕانی خاوەن کتێبەکان وهاوبەش بڕیاردەران پێیان خۆش نییە هیچ خێر وچاکەیەکتان لە لایەن خوداوە ﷻ بۆ دابەزێت ، خودا ڕەحمەت وبەزەیی خۆی تایبەت دەکات بە هەرکەسێك کە بیەوێت ، بە ڕاستی خودا خاوەن فەزڵ ونیعمەتی زۆر گەورە وبەرفراوانە .

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دوژمنانی ئیسلام چاویان بەخێری موسڵمانان هەڵنایەت وهەردەم لە بۆسەدان بۆ زیان پێگەیاندنیان ، وئیسلام وباوەڕ وقورئان ورەوانەکردنی پێغەمبەر ﷺ لە نیعمەتە هەرە گەورەکانی خودایە ﷻ بەسەر موسڵمانانەوە ، بۆیە پێویستە مننەتباربن وسوپاس وستایشی خودابکەن کە سەرجەم بێباوەڕان بە هەموو جۆرەکانیانەوە ئیرەییان پێدەبەن لەسەری .

﴿۞مَا نَنسَخۡ مِنۡ ءَايَةٍ أَوۡ نُنسِهَا نَأۡتِ بِخَيۡرٖ مِّنۡهَآ أَوۡ مِثۡلِهَآۗ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ١٠٦﴾ ئێمە هیچ ئایەتێك ناسڕینەوە وحوكمەكەی هەڵناگرین ، یان وشەكانی ناگۆڕین ، یان لەبیرتانی نابەینەوە ، یان دابەزاندنی دواناخەین ، باشتر لەوە یان هاوشێوەی دێنین ، مەگەر نازانی كە خودا ﷻ توانا ودەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە ؟.

الجزء الأول | سورة البقرة



۞مَا نَنسَخۡ مِنۡ ءَايَةٍ أَوۡ نُنسِهَا نَأۡتِ بِخَيۡرٖ مِّنۡهَآ أَوۡ مِثۡلِهَآۗ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ١٠٦ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ١٠٧ أَمۡ تُرِيدُونَ أَن تَسۡـَٔلُواْ رَسُولَكُمۡ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١٠٨ وَدَّ كَثِيرٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَوۡ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِكُمۡ كُفَّارًا حَسَدٗا مِّنۡ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡحَقُّۖ فَٱعۡفُواْ وَٱصۡفَحُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٠٩ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ١١٠ وَقَالُواْ لَن يَدۡخُلَ ٱلۡجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ تِلۡكَ أَمَانِيُّهُمۡۗ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١١١ بَلَىٰۚ مَنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ فَلَهُۥٓ أَجۡرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ١١٢

١٧

ئەم ئایەتە بەڵگەیە كە هەندێك ئایەت لە قورئان لە هەندێكی تریان باشترن ، وخودا ﷻ هەندێك ئایەتی سڕیوەتەوە وحوكمەكەی هەڵگرتووە ، یان حوكمەكەی هەڵگرتووە وئایەتەكە لە قورئاندا ماوەتەوە ، سڕینەوەی ئایەتەكانی قورئان سێ جۆرە : یەكەم : سڕینەوە وهەڵگرتنی ئایەتەكە وحوكمەكەی ، دووەم : سڕینەوەی حوكمەكە ومانەوەی ئایەتەكە ، سێیەم : سڕینەوەی ئایەتەكە ومانەوەی حوكمەكەی ، ئیبن عثیمین دەڵێت : ئەم ئایەتە وەك دەستپێك ورێخۆشكارێكە بۆ گۆڕینی قیبلە لە (بیت المقدس)ەوە بۆ (كەعبە) ، بۆیە لێرە هەتا سەرەتای جوزئی دووەم گفتوگۆیە لەگەڵ خاوەن كتێبەكان كە زۆر بە توندی نكولی گۆڕینی قیبلەیان كرد لە بیت المقدسەوە بۆ كەعبە ، والقرطبی دەڵێت : زانایانی سەلەف كۆدەنگن كە نەسخ لە شەریعەتی ئیسلامدا هەیە .

﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾﴾ مەگەر نازانی کە ئاسمانەکان وزەوی هەموو موڵکی خودایە ﷻ ، وکەس جگە لە خودا ﷻ پشتیوان ودۆستتان نییە کە خێری بۆتان بوێت ، وکەس سەرخەرتان نییە جگە لە خودا کە خراپەتان لێ دووربخاتەوە .

﴿أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾﴾ ئایا دەتانەوێت پرسیار لە پێغەمبەرەکەتان ﷺ بکەن وەك پێشتر نەوەکانی یەعقوب پرسیاریان کرد لە موسا ﵇ ، هەرکەس بێباوەڕی بە باوەڕ بگۆڕێتەوە بێگومان لە ڕێگەی ڕاستی مامناوەند لایداوە وگومڕابووە .

خودا ﷻ یاساغیکردووە لە زۆر پرسیارکردن لە شتێك پێش ڕوودانی وەك دەفەرموێت : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٠١﴾﴾(المَائِدَة) ، بوخاری ومسلم لە المغیرەی کوڕی شعبەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت پێغەمبەری خودا ﷺ قەدەغەی وتی وتی ، وپارە وسامان بەفیڕۆدان ، وزۆر پرسیارکردنی کردووە .

﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾﴾ زۆرێك لە جوولەکە وگاورەکان دوای ئەوەی حەق وڕاستیان بۆ ڕوون بوویەوە لە ناخیانەوە ئیرەییتان پێدەبەن وپێیان خۆشە پاشگەزتان بکەنەوە ، وهەڵتان بگەڕێننەوە

لە ئاینەکەتان دوای ئەوەی باوەڕتان هێناوە ، لێبوردەبن وچاوپۆشی بکەن هەتا فەرمانی دیکەی خوداتان ﷻ بۆ دێت ، بە دڵنیاییەوە خودا دەسەڵات وتوانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە .

ئەبو الشیخ لە "كتاب الأخلاق"دا لە ئوسامەی کوڕی زەید رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە ومقبل الوادعی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ سواری گوێدرێژێك بوو بە سەعدی رضي الله عنه وت : نابیستی باوکی حوباب مەبەستی عبداللەی کوڕی ئوبەی بوو چی دەڵێت : وا ووای وتووە ، سەعد کوڕی عوبادە رضي الله عنه وتی : لێی ببوورە وچاوپۆشی لێبکە ، پێغەمبەری خودا ﷺ لێی خۆشبوو ، وپێغەمبەری خودا ﷺ وهاوەڵەکانی لە خاوەن کتێبەکان وهاوبەش بڕیاردەران خۆش دەبوون ، خودا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿فَٱعۡفُواْ وَٱصۡفَحُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٠٩﴾ ، وئیبن ئەبوحاتەم والواحدی والبیهقی لە کەعبی کوڕی مالکەوە ڕیوایەتیان کردووە وئیبن حجر بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : کەعبی ئەشرەفی جوولەکە شاعیربوو وقسەی نەشیاوی بە پێغەمبەری خودا ﷺ دەگوت ، وبێباوەڕانی قورەیشی بە شیعر هاندەدا لە دژی ، کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ کۆچیکرد بۆ مەدینە هاوبەش بڕیاردەران وجوولەکەکان ئازارێکی زۆری خۆی وهاوەڵەکانیان دەدا ، خودا ﷻ فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کرد ئارام بگرێت ولێیان خۆشبێت ، ئەو ئایەتە دەربارەی ئەوان دابەزیوە : ﴿وَدَّ كَثِيرٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَوۡ يَرُدُّونَكُم﴾ تاوەکو ﴿فَٱعۡفُواْ وَٱصۡفَحُواْ﴾ ، ئیبن عەباس رضي الله عنهما دەڵێت : ﴿فَٱعۡفُواْ وَٱصۡفَحُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓۗ﴾ نەسخکراوە وحوکمەکەی هەڵگیراوە بەو ئایەتەی کە دەفەرموێت : ﴿فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ ٥﴾(التَّوۡبَة) ، وئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت : ﴿قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ هەتاکو ﴿وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩﴾(التَّوۡبَة) ، ئەمە حوکمی لێبوردەی لە هاوبەش بڕیاردەران هەڵگرت .

﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ١١٠﴾ نوێژەکانتان بەو شێوەیە ئەنجامبدەن کە فەرمانتان پێکراوە وزەکاتی سامانەکانتان دەربکەن ، وبیدەن بەو کەسانەی شایستەن ، ئەوەی بۆ نەفسی خۆتان پێشی دەخەن لە چاکە لای خودا ﷻ پاداشتی بە دە هێندە وزیاتر وەردەگرنەوە ، بە دڵنیاییەوە خودا بینەری هەموو ئەو کردەوانەیە کە ئەنجامی دەدەن .

ئەم ئایەتە هاندانی تێدایە بۆ ئەنجامدانی کردەوە باشەکان ودەست پێکردن بە گرنگترین ئینجا گرنگتر وگرنگ ، وبەفیڕۆ نەدانی کات لە شتی بێسود ، چونکە خودا ﷻ کردەوەکان کۆ دەکاتەوە پاداشتیان لەسەر دەداتەوە .

﴿وَقَالُواْ لَن يَدۡخُلَ ٱلۡجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ تِلۡكَ أَمَانِيُّهُمۡۗ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١١١﴾ جوولەکە دەیانگوت : هەرکەس جوولەکە نەبێت ، وگاورەکانیش دەیانگوت : هەرکەس گاور نەبێت ، ناچێتە بە هەشتەوە ، ئەوەش تەنها خۆزگە خواستنێکی بێهودە بوو بەبێ ئەوەی هۆکاری بۆ بگرنەپێش وکردەوەی باشی بۆ ئەنجام بدەن ، ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ : بەڵگە بهێننەوە لەسەر ئەو بانگەشەیەتان ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن .

﴿بَلَىٰۚ مَنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ فَلَهُۥٓ أَجۡرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ١١٢﴾ نەخێر ئەوەی جوولەکە وگاورەکان دەیڵێن ڕاست نییە ، نەخێر بەڵکو هەرکەس ملکەچی فەرمانەکانی خودابێت ﷻ وبە نیاز پاکییەوە بیپەرستێت وچاکەکاربێت ، ئەوا پاداشتی لای پەروەردگاریەتی ، وترسیان لەسەر نییە بۆ داهاتویان وخەفەت ناخۆن بۆ ئەوەی لە دونیا لە دەستیان دەرچووە .


الجُزءُ الأوَّلُ سُورَةُ البَقَرَةِ

وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ لَيۡسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيۡسَتِ ٱلۡيَهُودُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُمۡ يَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ مِثۡلَ قَوۡلِهِمۡۚ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمۡ أَن يَدۡخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَۚ لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١١٤﴾ وَلِلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُۚ فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿١١٥﴾ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿١١٦﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿١١٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴿١١٨﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١١٩﴾

١٨

شایانی باسە کردەوە کاتێك بە کردەوەی چاك ئەژمار دەکرێت کە دوو مەرجی تێدابێت ، یەکەم: بە نیاز پاکییەوە بۆ خودا ﷻ ئەنجامبدرێت ، دووەم : لەسەر سوننەتی پێغەمبەری خودابێت ﷺ ، ئەگەر بە نیاز پاکییەوە ئەنجامبدرێت ولەسەر سوننەت نەبێت وەرناگیرێت ، وئەگەر لەسەر سوننەتیش بێت وبە نیازی پاکەوە ئەنجام نەدرابێت وەرناگیرێت ، بوخاری ومسلم لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە رضي الله عنها ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : هەرکەس شتێك دابهێنێت کە لە ئاینەکەماندا نەهاتبێت ڕەت دەکرێتەوە ووەرناگیرێت ، ولە ڕیوایەتی مسلم دا دەفەرموێت : هەرکەس کردەوەیەك بکات فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ڕەت دەکرێتەوە .

﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ لَيۡسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيۡسَتِ ٱلۡيَهُودُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُمۡ يَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ مِثۡلَ قَوۡلِهِمۡۚ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾﴾ جوولەکەکان وتیان : گاورەکان لەسەر ڕێگەی ڕاستنین وئاینەکەیان پووچەڵە ، وگاورەکانیش وتیان : جوولەکەکان لەسەر ڕێگەی ڕاستنین وئاینەکەیان پووچەڵە ، ئەوە لە کاتێکدا لە تەورات وئینجیلدا باسی ئاینەکانی یەکتریان دەخوێندەوە ، کە

کتێبی خودا بوون بۆی ناردبوون لە تەوراتدا مژدەی هاتنی عیسای ﷺ تێدابوو ، وئینجیلیش باسی ئەو ئاینەی بە ڕاست دانابوو کە پێغەمبەر موسا ﷺ لەسەری بوو ، وهەروەها ئەو کەسانەی نەزان بوون هەمان قسەی جوولەکە وگاورەکانیان دەکرد ، خودا ﷻ حوکم دەکات لە نێوانیان لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەوەی کە ناکۆکن ، وڕوونی دەکاتەوە کێ لەسەر حەقە وکێ لەسەر پووچەڵە .

ئەوەی کە جوولەکەکان دەیانگوت : گاورەکان ئاینەکەیان پووچەڵە درۆیان دەکرد ، چونکە خودا پێغەمبەر عیسای ﷺ ڕەوانەکرد دەبوو لەو کاتەدا لە پێش هاتنی ئیسلام جوولەکەکان باوەڕی پێبهێنن وشوێنی بکەون ، بەڵام وتەی گاورەکان بۆ جوولەکەکان ڕاستبوو ، چونکە ئەوان ئاینەکەیان گۆڕی بوو ، وخودا ﷻ ئاینەکەیانی نەسخکردەوە وسڕییەوە وشەریعەتی نوێی بە پێغەمبەر عیسا ﷺ بۆ ناردن وئینجیلی بۆ دابەزاندن ، بەڵام ملهوڕبوون وباوەڕیان نەهێنا ، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە هەرکەس بە زانینەوە تاوان ئەنجام بدات لۆمە وسەرزەنشتی زیاتر دەکرێت وەك لە کەسێك کە بە نەفامی ونەزانینەوە ئەنجامی بدات ، چونکە خودا ﷻ سەرزەنشتی جوولەکە وگاورەکانی کرد بەوەی یەکتر کافردەکەن وقسەی هاوشێوەی نەزانەکان دەکەن لە کاتێکدا دەزانن ولە تەورات وئینجیلە وە زانیارییان هەبوو ، الطبری والواحدی لە ئیبن عباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە وئیبن حجر لە "العجاب"دا لە سەنەدەکەی بێدەنگبووە ، دەڵێت : کاتێك خەڵکی نەجران کە گاوربوون هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ ، حاخامەکانی جوولەکەش هاتن بۆ لایان ، لای پێغەمبەری خودا ﷺ بوو بە ناکۆکی ودەمەقاڵەیان ، رافعی کوڕی حریملە وتی : ئێوە ئاینەکەتان پووچەڵە وکوفری کرد بە عیسا ﷺ وئینجیل ، وپیاوێکی خەڵکی نەجران لە گاورەکان بە جوولەکەکانی وت : ئێوە ئاینەکەتان پووچەڵە ونکولی پێغەمبەرایەتی موسای کرد ﷺ وکوفری کرد بە تەورات ، خودا ﷻ ئەم

ئایەتەی دابەزاند : ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ لَيۡسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيۡسَتِ ٱلۡيَهُودُ عَلَىٰ شَيۡءٖ﴾ .

﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمۡ أَن يَدۡخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَۚ لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١١٤﴾ کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە ڕێگیری دەکات زیکر ویادی خودا ﷻ ونوێژ لە مزگەوتەکاندا ئەنجام بدرێت ، وهەوڵی تێکدان وڕووخان وکاول کردنیان بدات ، ئەوکەسانە هەر بۆیان نییە بچنە نێو مزگەوتەکانەوە ، بە ترس ولەرزەوە نەبێت ، چ جای ئەوەی ڕێگری لە موسڵمانان بکەن وهەوڵی ڕووخانی بدەن ، ئەوانە لە دونیا سەرشۆڕ وڕیسوان ، ولە ڕۆژی قیامەتدا تووشی سزای زۆر سەخت دەبنەوە .

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەندێك تاوان لە هەندێکی خراپتر وگەورەترە وسزاکەی قورسترە ، وڕێز وگەورەیی مزگەوتەکانی تێدایە لەبەر ئەوەی خودا ﷻ داویەتیە پاڵ خۆی وەك ڕێزێك ، زانایان دەڵێن : هەوڵی تێکدانی مزگەوت وڕووخان وپیسکردن وبێڕێزیکردن بە شکۆی مزگەوتەکان دەگرێتەوە ، وهەروەها لادانی مزگەوت لە ئەو ئەرکانەی بۆی دروستکراوە دیسان دەیگرێتەوە ، کەواتە ئەگەر کەسانێك مزگەوتەکان وپەیامە پیرۆزەکەی بە لاڕێدابەرن وبۆ بەرژەوەندی حیزبی وکەسی بەکاریبهێنن دەبێت ڕێگیریان لێبکرێت ، وسەرزەنشت بکرێن لەسەر ئەو کارانە : بۆ نموونە ئەگەر کەسێك مزگەوت بۆ حیزبایەتی کردن وپارچە پارچەکردنی موسڵمانان ، یان کۆکردنەوەی پارە لە موسڵمان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی یان بلاوکردنەوەی بیدعە وگومرایی ولاڕێی ودژایەتی کردنی سوننەت ، یان هەر بەرژەوەندییەکی تری دونیایی بەکاربهێنێت دەبێت ڕێگیری لێبکرێت ، مسلم لە ئەبوهریرەوە

ﷺ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : هەرکەس گوێی لە کەسێك بوو کە بانگەوازی بۆ شتێکی ون بوو دەکرد لە مزگەوتدا بابڵێت : خودا بۆتی نەگێڕێتەوە ، چونکە مزگەوتەکان بۆ ئەم مەبەستە دروست نەکراون ، وەهەروەها لە بریدەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە کەسێك لە مزگەوت بانگەوازی کرد ، کە حوشترێکی سوری لیٚ ونبوو بوو ، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : یاخودا نەیدۆزیتەوە چونکە مزگەوتەکان دروستکراون بۆ ئەوەی بۆی دروستکراون .

﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ١١٥﴾ ڕۆژهەلات ورۆژئاوا موڵکی خودان ﷻ ڕوو لە هەرکوێیەك بکەن ڕووی خودا ﷻ لەوێیە ، بە دڵنیاییەوە خودا زانست وزانیاری ودەسەڵاتی زۆر بەرفراوانە .

زانایان ناکۆکن لە لێکدانەوەی ﴿وَجْهُ ٱللَّهِۚ﴾ هەندێك دەڵێن : مەبەست پێی ڕووی پەروەردگارە ، وەهەندێکیان دەڵێن : مەبەست پێی ئاڕاستەیە ، وڕوو لە هەرکوێیەك بکەن خودا ﷻ لەوێیە ، بەڵام بۆچوونی یەکەم پەسەندترە چونکە مەزهەبی ئەهلی سوننەت ڕواڵەتی دەقەکان دەبەن ئەگەر ڕێگرێکی صەحیح نەبێت کە بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی کە ڕواڵەتەکە مەبەست نییە ، بوخاری ومسلم لە عبداللەی کوڕی عومەرەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا بەڵغەمێکی بە دیواری مزگەوتەوە لە ڕووی قیبلەوە بینی ، کڕاندی وپاشان ڕووی کردە خەڵکەکە ووتی : ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژیکرد با تف وبەڵغەم نەکاتە پێشی خۆی ، چونکە خودا ﷻ لە پێشیەتی کاتێك نوێژ دەکات ، ئەمەش مانای ئەوە نییە خودا ﷻ لە هەموو شوێنێکە بەڵکو لەسەر عەرشە هەروەك لە دەقەکانی تری قورئان وفەرموودە ڕاستەکان وکۆ دەنگی زانایانی سوننەتدا هاتووە ، بەڵام موسڵمانان لە هەرکویٚ نوێژ بکەن ڕوودەکەنە قیبلە وڕووی خودای پەروەردگاریش لەوێیە ﷻ ، ئەمەش وەڵامە بۆ سۆفییە

حلولییەکان کە دەڵێن : خودا لە هەموو شوێنێکە بە زاتی پیرۆزی ، مسلم لە معاویە کوڕی حەکەمی السلمیەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : هاتم بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ پرسیارم لێکرد دەربارەی کەنیزەکێك کە زللەیەکم لێدابوو ، لەبەر ئەوەی گورگ کەوتبووە ناو ڕانە مەڕەکەی ومێیەکی خواردبوو ، پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوکارەی زۆر بەگەورە دانا وبەخراپ باسیکرد ، وتم : ئازادی بکەم ؟ ، فەرمووی : بیهێنە بۆ لام ، هێنام : پێی فەرموو : خودا لە کوێیە ؟ ، وتی ، لە ئاسمانە ، فەرمووی : من کێم ؟ ، وتی : تۆ پێغەمبەری خودایت ، فەرمووی : ئازادی بکە چونکە باوەڕدارە ، وهەروەها وەڵامە لە دژی ئەوانەی نەفی سیفەتەکانی خودای پەروەردگار دەکەن وڕەتی دەکەنەوە ودەڵێن : خودا نەلە سەرە ونەلە خوارە ونەلە پێشە ونەلە پشتە ونەلە ڕاستە ونەلە چەپە ، وبەڵگەی ئەوەی تێدایە کە خودا ﷻ ڕووی هەیە بەو شێوەیەی کە شایستەیەتی ولە هیچ کام لە دروستکراوەکانی ناچێت ، الترمذی وئیبن ماجە لە عامری کوڕی ربیعە ﵁ ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە "حسن لغیره" داناوە ، دەڵێت : لە سەفەردا لەگەڵ پێغەمبەری خودابووین ﷺ ئاسمان هەور بوو وشەوێکی تاریك بوو ، نەمانزانی ئاراستەی قیبلە لە کوێیە ، هەریەکەمان لای خۆیەوە نوێژی کرد ، کاتێك ڕۆژمان کردەوە باسی ئەوەمان کرد بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ ، ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِۚ﴾ ، ومسلم لە عبداللەی کوڕی عومەرەوە ﵄ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ لە مەککەوە دەهات بەرەو مەدینە لەسەر سوارییەکەی ڕووی لە هەر لایەك بووایە نوێژی سوننەتی دەکرد ، ئەم ئایەتە لەو بارەیەوە دابەزی : ﴿فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِۚ﴾ .

﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ١١٦﴾ ووتیان خودا منداڵی بۆ خۆی هەڵبژاردووە ، پاك وبێگەردی بۆ خودا ، بەڵکو هەموو ئەوەی لە

ئاسمانەکان وزەویدا هەیە موڵکی پەروەردگارە ، وهەموویان ملکەچ وفەرمانبەرداری خودان ﷻ.

جوولـەکەکان دەیانگوت : عوزەیر کوڕی خودایە ، وگاورەکانیش دەیانگوت : مەسیح کوڕی خودایە ، وهاوبەش بڕیاردەران دەیانگوت : فریشتە کچی خودایە ، ئەمەش سنور بەزاندن وبێڕێزی بوو بەرامبەر پەروەردگار ، بوخاری لـە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : خودا ﷻ دەفەرمویت : نەوەی ئادەم درۆی بۆکردم ونەدەبوو ئەوە بکات ، وبێڕێزی کرد بەرامبەرم کە نەدەبوو ئەوە بکات ، درۆکردنەکەی ئەوە بوو بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە من ناتوانم دوای مردنی زیندووی بکەمەوە ، وبێڕێزییەکەشی ئەوە بوو بە منی دەگوت : خودا منداڵی هەیە ، پاك وبێگەردی بۆ من لـەوەی کە منداڵ یان هاوژینم هەبێت ، الـواحدی دەڵێت : ئەم ئایەتە دەربارەی جوولـەکە دابەزی کاتێك وتیان : ﴿عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ ﴿٣٠﴾﴾(التَّوۡبَة) ، وگاورەکانی نەجران کاتێك وتیان : ﴿ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ ﴿٣٠﴾﴾(التَّوۡبَة) ، وهاوبەش بڕیاردەرانی عەرەب کە دەیانگوت : فریشتەکان کچی خودان .

﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿١١٧﴾﴾ داهێنەری ئاسمانەکان وزەوییە وئەگەر فەرمان بکات بە هەرشتێك هەر ئەوەندە بفەرموێت ببە دەستبەجێ دەبێت .

ئەم ئایەتە دەرخەری گەورەیی دەسەڵاتی خودایە ﷻ کە بە تەنها فەرمانێك ئەوەی بیەوێت ئەنجام دەدرێت بەبێ دواکەوتن فەراهەم دەبێت ، وئەوەی خودای پەروەردگار قسە دەکات بە پیت ودەنگی بیستراوە ، بەڵام بە دەنگێك کە شایستەی گەورەیی ومەزنی پەروەردگاربێت ، ولـە

دەنگی دروستکراوەکانی ناچێت ، وئەوەی چۆن زیندەوەرەکان ملکەچن بە هەمان شێوە شتە نازیندووەکانیش ملکەچی فەرمانی خودان ﷻ .

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ١١٨﴾ ئەوانەی کە نەزان بوون وتیان : ئەی بۆچی خودا قسەمان لەگەڵ ناکات ، یان بەڵگە ونیشانەیەکمان ناداتێ ، هەروەها ئەوانەی پێش ئەمان هەمان قسەیان کرد ، دڵەکانیان چوونیەکە ، بەڵگە ونیشانەکانمان ڕوون کردووەتەوە بۆ ئەو کەسانەی باوەڕی پتەویان هەیە ودڵیان نەخۆشی گومانی تێدا نییە .

عەرەبە هاوبەش بڕیاردەرەکان دەیانگوت : بۆچی خودا قسەمان لەگەڵ ناکات وەك چۆن جوولەکە بە موسایان ﷺ وت : با خودا بە ئاشکرا ببینین ، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە لە دێر زەمانەوە ئەوانەی شوێن پووچەڵی کەوتوون وئەوانەی بیدعەچی ولاڕێن دڵ وفیکر وبۆچوونەکانیان لەیەك دەچێت ، بۆیە دەبینیت هەموو ئەوەی باسی دەکەن لە پێشینە خراپەکانیانەوە بۆیان ماوەتەوە وشتێکی تازەیان پێ نییە .

﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ١١٩﴾ ئێمە پەیامی حەقمان بە تۆدا ڕەوانەکردووە ئەی پێغەمبەر ﷺ کە مژدە بدەیت بەوکەسانەی باوەڕیان هێناوە وچاکەکارن ، وئەو کەسانەش بترسێنیت کە بێباوەڕن وکردەوەی باش ئەنجام نادەن ، تۆ پرسیارت لێناکرێت دەربارەی ئەو کەسانەی هاوەڵی دۆزەخن ، یان مەپرسە لە هاوەڵانی ئاگری دۆزەخ کە لە چ سزا وناڕەحەتیەکی سەخت ودژواردان .

ئەم ئایەتە بەڵگەیە كە بێباوەڕان بە هەمیشەیی لـە ئاگردا دەمێننەوە چونكە دەفەرموێت : هاوەڵانی ئاگر ، وئەوەشی تێدایە پێغەمبەران وبانگخوازان تەنها گەیاندنیان لـەسەرە وبەرپرس نین لـە چارەنووسی خەڵك .

﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾﴾

جوولـەكە وگاور لـێت ڕازینابن هەتا شوێن ئاینەكەیان نەكەویت ، پێیان بڵـێ : ئەوەی ئێوە لـەسەرین هیدایەت وڕێگەی ڕاست نییە ، بەڵكو بێگومان هیدایەت تەنها هیدایەتی خودایە ، بێگومان ئەگەر شوێن حەز وئارەزووەكانیان بكەویت دوای ئەوەی زانستت بۆ هاتووە بە سروش كە قورئان وسوننەتە ، كەس نییە جگە لـە خودا ﷻ بتپارێزێت وپشتیوان وسەرخەرت بێت .

پێغەمبەری خودا ﷺ حەزی نەدەكرد پێچەوانەی جوولـەكە وگاورەكان بكات ودڵیانی ڕاگیر دەكرد ، خودا ﷻ ئاگاداری كردەوە كە ئەوانە كەسانێكی كەللـەڕەقن چەندە دڵنەواییان بكەیت وچاوپۆشیان لـێبكەیت هیدایەت وەرناگرن وشوێنی ئاینەكەت ناكەون هەتا پەیڕەوی لـە ئاینەكەی ئەوان نەكەیت ، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە هەركەس پشت لـە هیدایەتی قورئان وسوننەت بكات بێ پشت وپەنایە ، وسەركەوتوو نابێت بەڵكو سەرشۆڕ ودەستەمۆ وملكەچی بێباوەڕەكان دەبێت ، وجوولـەكە وگاور بێباوەڕن ، وپشتیان لـە ئاین كردووە وشوێن حەز وئارەزوویان كەوتوون ، وهەموو ئاینەكانی تر جگە لـە ئیسلام یەكن وچارەنوسیان ئاگری دۆزەخە ، وگومڕا وسەرلـێشێواون ، هەموو ئەو حوكم وزانیاریانەی لـە قورئان وسوننەتدا هاتووە زانستە ، وهەركەس چەندە شارەزایانبێت بەو ئەندازەیە زانایە بەڵام هەركەس زانیاری دروستی بە قورئان وسوننەت نەبێت زانا نییە باخۆیشی بە زانا بزانێت یان خەڵك بانگەشەی ئەوەی بۆ بكەن كە زانایە .

﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ١٢١﴾ ئەوانەی کتێبمان پێبەخشیون بە باشترین شێوە دەیخوێننەوە وگوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەکەن ولە قەدەغە کراوەکانی دوور دەکەونەوە ، ئەوانە باوەڕ بە پێغەمبەری خودا محمد ﷺ دەهێنن ، وهەرکەس باوەڕی پێنەهێنێت بەڕاستی دۆڕاو وزیانمەندە .

ئەو جوولەکە وگاورانەی تەورات وئینجیلی دەستکاری نەکراو ونەشێوێنراویان دەخوێندەوە وشوێن فەرمانەکانی کەوتن موسڵمان بوون ، وئەو موسڵمانانەی بە جوانی قورئان دەخوێننەوە وحەڵاڵی بە حەڵاڵ دەزانن وحەرامی بە حەرام دەزانن وگوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەکەن ، ولە یاساغییەکانی دوور دەکەونەوە ولێکدانەوەی هەڵە بۆ ماناکانی ناکەن وکردار بە ئایەتە ڕوون وئاشکراکانی (محکم) دەکەن ، وباوەڕیان هەیە بە ئەو ئایەتانەی ڕاستەوخۆ مانای تەواو نادەن (متشابه) ، ولە هەرچییەکی تێنەگەن پرسیار لە زاناکان دەکەن ، ئەوانە باوەڕ بە قورئان ومحمدی پێغەمبەر ﷺ دەهێنن وبە باشی شوێنی دەکەون ، ئەم ئایەتە بەڵگەیە ئەو کەسانەی قورئان بە جوانی دەخوێننەوە وماناکەی تێدەگەن ئەوانە بە ڕاستی باوەڕدەهێنن وشوێنی پێغەمبەری خودا ﷺ دەکەون .

الجزء الأول | سورة البقرة

وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡۗ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم بَعۡدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ١٢٠ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ١٢١ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٢٢ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ١٢٣



۞ وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ١٢٤ وَإِذۡ جَعَلۡنَا ٱلۡبَيۡتَ مَثَابَةٗ لِّلنَّاسِ وَأَمۡنٗا وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ وَعَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ١٢٥ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنٗا وَٱرۡزُقۡ أَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُم بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلٗا ثُمَّ أَضۡطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ١٢٦

١٩

﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٢٢﴾ ئەی نەوەکانی یەعقوب : هەموو ئەو نیعمەتانەی من بە یاد بهێننەوە کە پێم بەخشیبوون وفەزڵ وڕێزی ئێوەم دابوو بەسەر هەموو خەڵکی سەردەمی خۆتاندا .

لەو نیعمەتە گەورانەی کە پێیان بەخشرابوو هەڵبژاردنی پێغەمبەران بوو لە نێویاندا ، ودابەزاندنی کتێب ، وبەخشینی تەختی پاشایەتی بوو بە هەندێکیان ، ئەم دووبارە بە یاد هێنانەوەیە بۆ زیاتر ئامۆژگاریکردن وسەرنج ڕاکێشانی جوولەکە وگاورەکان بوو .

﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ١٢٣﴾ بترسن وخۆتان ئامادە بکەن بۆ ڕۆژێك کە کەس هیچ سودێك بە کەس ناگەیەنێت ، وهیچ شتێك لە بری بەخشینی کەس وەرناگیرێت وتکا ونێوانگیری کەس قەبوڵ ناکرێت ، وکەس ناتوانێت فریادڕەس بێت ورزگاریان بکات لە سزای خودا .

ئەو تکاکاری ونێوان گیرییەی ڕەتکراوە ئەو تکاکارییانە ناگرێتەوە کە پێغەمبەران وپیاوچاکان وهەرکەس خودا ڕوخسەتی بدات دەیکەن بۆ ئەو کەسانەی کە شایستەن تکایان بۆ بکرێت ، ولە دونیادا خەڵك دەتوانن بە پارە وسامان یان پلە وپایە وناوبانگ خۆیان دەرباز بکەن لەو سزایانەی کە پێویست دەبێت لەسەریان لەبەر ئەنجامدانی کردەوەی خراپ وسەرپێچی وبەزاندنی سنورەکان ، بەڵام لە قیامەتدا ئەوەی دەبێتە هۆکاری دەربازبوون وسەرفرازی تەنها ئەو کردەوە چاکانەیە کە باوەڕدار لە دونیا ئەنجامیان دەدات .

﴿۞وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ١٢٤﴾ ئەوەشیان بەبیربهێنەوە کە ئیبراهیم عليه السلام تاقیکرایەوە لە

لایەن پەروەردگارییەوە بە کۆمەڵە وشەیەك ، ئیبراهیم ﵇ لە هەموو تاقیکردنەوەکاندا بە باشی دەرچوو ، خودا ﷻ فەرمووی : من دەتکەمە پێشەوای خەڵك ، ئیبراهیم ﵇ فەرمووی : ئەو پێشەوایەتیە بە نەوەکانیشم ببەخشە ، خودا ﷻ فەرمووی : ئەو کەسانەی ستەمکارن بەڵێنی من نایانگرێتەوە .

ئیبراهیم وشەیەکی سریانییە وبەمانای باوکی بە بەزەییە ، زانایان ناکۆکن ئەو شتانە چیبوون کە ئیبراهیم ﵇ پێی تاقیکرایەوە وبەسەرکەوتویی ئەنجامیدان ولێیان دەرچوو ؟ ، وتراوە : ئەوەیە کە پێی فەرموو : دەتکەینە پێشەوای خەڵك ، یان سەربڕینی ئیسماعیلی کوڕی ، یان خەسڵەتەکانی فیترەتە ، یان چوونە ناو ئاگرەکەیە ، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەران وپیاوچاکان تاقیدەکرێنەوە ، ئەحمەد والترمذی لە سعدی کوڕی ئەبووقاصەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : پرسیار کرا لە پێغەمبەری خودا ﷺ کێ لە هەموو خەڵك تاقیکردنەوە وبەلای توندترە ؟ ، فەرمووی : پێغەمبەران ، پاشان ئەوانەی بە جوانی شوێنیان دەکەون ، هەموو کەسێك بە گوێرەی ئاینداریتییەکەی تاقیدەکرێتەوە ، ئەگەر توند دەستی بە ئاینەکەیەوە گرتبێت بەردەوامی ودامەزرانی پێدەبەخشرێت ، بەلام ئەگەر لە ئاینداریەکەیدا کەمتەرخەم بوو تاقیکردنەوە سوك دەکرێت لەسەری ، بەدڵنیاییەوە بەردەوام تاقیکردنەوە وبەلا تووشی مرۆڤ دەبێت هەتا بەسەر زەویدا دەڕوات وپاك دەبێتەوە لە تاوان ؛ وئەم ئایەتە ترسناکی چارەنووسی ستەمکاران دەردەخات لە دونیا سەرەڕای خراپی دوارۆژیان ، وهەروەها نزا وپاڕانەوە وداوای پێشەوایەتی کردن بۆ نەوەکانی تێدایە .

﴿وَإِذۡ جَعَلۡنَا ٱلۡبَيۡتَ مَثَابَةٗ لِّلنَّاسِ وَأَمۡنٗا وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ وَعَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ١٢٥﴾ ئەی پێغەمبەری خودا

ﷺ ئەوەیان بۆ بگێڕەوە کە ئێمە ئەم ماڵە کە کەعبەیە کردوومانەتە شوێنێك کە حاجی وعومرەکاران بۆی دەگەڕێنەوە ، وسەر ومالّ وسامانی خەڵکی تێدا پارێزراوە ، بە شێوەیەك ڕووەك وگیانلەبەرانیش لەو ئاسایشە بەهرەمەندن ، لای ئەو بەردە "کە جێ پێی پێغەمبەر ئیبراهیمە ﷵ ودەچووە سەری بۆ بیناکردنی کەعبە دوای بەرزبوونەوەی دیوارەکانی" بکەنە جێنوێژ ، ئیبراهیم وئیسماعیلمان ڕاسپارد وفەرمانمان پێکردن کە ماڵەکەم پاك بکەنەوە بۆ تەوافکاران وئەوانەی ئیعتیکاف دەکەن وبۆ نوێژ خوێنان .

ئەم ئایەتە بەڵگەی گەورەیی وڕێزی زۆری کەعبەی پیرۆزی تێدایە لەبەر ئەوەی خودای پەروەردگار کردوویەتییە شوێنی وابەستەبوونی دڵی باوەڕداران وجێگەیەکی ئاسایش وهێمن ، وهەروەها گەورەیی ڕێز وپلەی ئیبراهیم وئیسماعیلی کوڕی کە شەرەفی دروستکردنی کەعبەی پێبەخشیوون ، وگومڕایی ئەو کەسانەی هەوڵی نانەوەی نائارامی وبشێوی دەدەن لە مەککە ، لەبەر ئەوە قەدەغەی هەڵگرتنی چەك کراوە لە نێو حەرەمدا ، بوخاری ومسلم لە سعیدی کوڕی جوبەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت : لەگەڵ عبداللەی کوڕی عومەردا بووم ﭭ کاتێك کەسێك لە خەوارجەکان بەسەری ڕمەکەی ژێر پێی بریندارکرد ، وپێی ئالآبوو لە زێنی سوارییەکەی ، دابەزیم ، ڕمەکەم لە پێی دەرهێنا لەو کاتە لە مینا بووین ، ئەو دەنگوباسە گەیشتە حەجاجی کوڕی یوسف وهات بۆ سەردانی ، حەجاج وتی : گەر بزانین کێ وایلێ کردوویت ؟! ، ئیبن عومەر ﭬ وتی : تۆ وات لە من کردووە ، وتی : چۆن ؟ ، وتی : چەك وتفاقی شەڕت هەڵگرتووە لە ڕۆژێکدا کە چەکی تیادا هەڵناگیرێت ، وچەکت بردووەتە نێو حەرەمەوە ونابێت چەك ببردرێتە نێو حەرەمەوە ، وبوخاری لە ئەنەسەوە ﭬ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : عومەری کوڕی خەتاب ﭬ وتی : لە سێ شتدا موافقەی خودام ﷻ کردووە ، وتم : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بریا لای بەردەکەی شوێن پێی پێغەمبەر ئبراهیممان دەکردە جێنوێژ

، ئەم ئایەتەدابەزی ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ﴾، هەروەها ئایەتی حجاب ، وتم : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بریا فەرمانت دەکرد بە خێزانەکانت کە لە پشتی پەردەوە قسە لەگەڵ خەڵك بکەن چونکە پیاوی باش وخراپ قسەیان لەگەڵ دەکەن ، ئایەتی حیجاب دابەزی ، وخێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کۆبوونەوە غیرەیان لێکرد ، پێم وتن : ئەگەر ئێوە تەڵاق بدات خودای پەروەردگاری ئێوە دەگۆڕێت وکۆمەڵە خێزانێکی پێدەبەخشێت لە ئێوە باشترن ، ئایەت لەو بارەیەوە دابەزی ؛ ئەو بەردە لە پاڵ دیواری کەعبەبوو لەبەر قەڕە باڵغی عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه هێناویەتییە ئەو شوێنەی ئێستای ، وسوننەتە دوای کۆتایی هاتنی تەوافی کەعبە دوو ڕکات نوێژ بکرێت وئەو بەردە لە نێوان نوێژخوێن وکەعبەدابێت ولە ڕکاتی یەکەمدا دوای خوێندنی سورەتی فاتیحە سورەتی الکافرون ولە ڕکاتی دووەمدا سورەتی الإخلاص بخوێنرێت .

﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنٗا وَٱرۡزُقۡ أَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُم بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلٗا ثُمَّ أَضۡطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ١٢٦﴾ وئەوەشیان بەبیربهێنەوە کە ئیبراهیم عليه السلام فەرمووی : پەروەردگارم ئاسایش وهێمنی لەم شارە بەرقەرار بکە وڕۆزی دانیشتوانەکەی بدە لە هەموو بەروبوومەکان ، ئەوانەیان کە باوەڕیان بە خودا وڕۆژی دوایی هێناوە ، خودا جل جلاله فەرمووی : کەمێك ڕۆزی ئەوانەش دەدەم کە بێباوەڕن بۆ گوزەرانی ژیانی دونیایان ، پاشان ناچار وپەلکێشی ئاگریان دەکەم کە خراپترین چارەنووسە .

﴿وَإِذۡ يَرۡفَعُ إِبۡرَٰهِـۧمُ ٱلۡقَوَاعِدَ مِنَ ٱلۡبَيۡتِ وَإِسۡمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ١٢٧﴾ وئەوەشیان بە بیر بهێنەوە کاتێك ئیبراهیم وئیسماعیل بنەڕەتی کەعبەیان بەرزدەکردەوە

الجُزْءُ الأَوَّلُ — سُورَةُ البَقَرَةِ

وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا ۖ إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَا ۖ إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُ ۚ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَىٰ لَكُمُ الدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِن بَعْدِي ۖ قَالُوا نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَٰهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ۖ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾

٢٠

دەیانفەرموو : ئەی پەروەردگارمان لێمانی وەربگرە بەدڵنیاییەوە تۆ بیسەری پاڕانەوەکانمانی وزانای بە کردەوەکانمان .

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە نابێت موسڵمان شانازی بکات بەو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدات وبەخەڵکی بفرۆشێتەوە ، بەڵکو دەبێت کردەوەی باش بە نیاز پاکییەوە ئەنجامبدات ولەسەر سوننەت بێت ، ولە خودا بپاڕێتەوە کە خودا ﷻ لێی وەربگرێت ، دەبینین ئەوە دوو پێغەمبەری زۆر بەڕێزن لای خودای پەروەردگار وپیرۆزترین ماڵ بە فەرمانی خودا ﷻ دروست دەکەن ، ودەپاڕێنەوە خودا لێیان وەربگرێت ، بوخاری فەرموودەیەکی درێژی لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتکردووە کە تیایدا هاتووە : ئیبراهیم ﷺ بە خێزانەکەی فەرموو : من سەردانی ئەو خێزانەم دەکەم کە لە مەککە بەجێم هێشتوون ، کە گەیشتە مەککە ئیسماعیلی عليه السلام لە پشتی زەمزەمەوە بینی تیری تیژ وچاك دەکرد پێی فەرموو : ئەی ئیسماعیل پەروەردگارت فەرمانی پێکردووم ماڵێکی بۆ دروست بکەم ، فەرمووی : گوێڕایەڵی پەروەردگارت بکە ، فەرمووی : فەرمانی پێکردووم کە تۆ یارمەتیم بدەیت بۆ دروستکردنی ، ئیسماعیل فەرمووی : کەواتە ئەنجامی بدە ، هەستان وئیبراهیم عليه السلام دیواری دەکرد وئیسماعیل عليه السلام بەردی دەدایە دەستی

ودەیانفەرموو : ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾﴾ ، هەتا دیواری کەعبە بەرزبوویەوە ، ئیبراهیم ﷺ کە پیر وبە ساڵداچووبوو نەیتوانی بەردەکان بگوێزێتەوە ، چووە سەر بەردی (مقام) وئیسماعیل ﷺ بەردی دەدایە دەستی .

﴿رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾﴾ پەروەردگارمان داوات لێدەکەین ولێت دەپاڕێینەوە ملکەچ وگوێڕایەڵی تۆبین وهەروەها لە نەوەکانمان هیدایەت بدە کە ئوممەتێکی ملکەچ وگوێڕایەڵ وموسڵمانی دامەزراوبین ، وفێری ئاینەکەمان بکە ودروشمەکانی حەج وشوێنی سەربڕینی هەدییەکانمان نیشان بدە ولێمان خۆشبە ، بێگومان تۆ زۆر لێخۆشبوو وبە بەزەییت .

﴿رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾﴾ پەروەردگارمان پێغەمبەرێکیان لە خۆیان بۆ ڕەوانە بکە کە ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە وفێری قورئان ودانایی وکاربەجێیان بکات ، وپاکیان بکاتەوە لە هەموو خوڕەوشتە خراپ ونابەجێکان ، بە دڵنیاییەوە تۆ زاڵ وتوانا ودانای کار لەجێیت .

حەسەنی بەسری دەڵێت : کتێب لەم ئایەتە مەبەستی قورئانە وحیکمەتیش مەبەست سوننەتە ، ئیبن عساکر لە "التاريخ" لە عبادەی کوڕی الصامتەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە حەسەنی داناوە ، دەڵێت : وترا ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەربارەی خۆت هەواڵمان بدەرێ ، فەرمووی : من پاڕانەوەی باوکم ئیبراهیمم ﷺ ، وکۆتا پێغەمبەرێك کە مژدەی بە هاتنی من داوە عیسای کوڕی مەریەمە ﷺ ، وئەحمەد وبوخاری لە "الأدب المفرد" وحاکم لە ئەبوهریرەوە

ﷺ ڕیوایەتیان کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : من نێردراوم بۆ ئەوەی ڕەوشت وئاکارە جوانەکان تەواو بکەم .

﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾﴾ کەس پشت لە ئاینەکەی پێغەمبەر ئیبراهیم عليه السلام ناکات ، ودەستبەرداری نابێت کە ئاینی یەکتاپەرستی ووازهێنان بوو لە هاوبەش بڕیاردان ، جگە لە کەسێك نەبێت کە نەفسی خۆی تووشی گێلی وگەمژەیی کردووە ، بێگومان ئێمە ئەومان لە دونیا هەڵبژارد ولە دواڕۆژیشدا لە پیاوچاکە پلە بەرزەکانە .

الثعلبی لە عبداللەی کوڕی سلامەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە وئیبن حجر لە سەنەدەکەی بێدەنگ بووە : کە بانگی هەردوو برازاکەی سلمە ومهاجری کردووە بۆ ئیسلام وپێیگوتن : بێگومان دەزانن کە خودا لە تەوراتدا فەرموویەتی : من لە نەوەی ئیسماعیل پێغەمبەرێك ڕەوانە دەکەم کە ناوی ئەحمەدە ، هەرکەس باوەڕی پێبهێنێت ئەوا ڕێنمای کراوە وهیدایەتی وەرگرتووە ، وە هەرکەس باوەڕی پێنەهێنێت نەفرەت لێکراوە ، سلمە موسڵمان بوو ، مهاجر ڕەتیکردەوە ، ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ﴾ .

﴿إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾﴾ کاتێك پەروەردگاری پێی فەرموو ملکەچ وگوێڕایەڵی پەروەردگارت بە ، فەرمووی : ملکەچ وگوێڕایەڵم بۆ پەروەردگاری هەموو بوونەوەر .

﴿وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَٰبَنِىَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾﴾ وهەروەها ئیبراهیم ویەعقوب ئامۆژگاری نەوەکانیان کرد وپێیان فەرموون :

بێگومان خودا ئاینی بۆ ئێوە هەڵبژاردووە دەستی پێوە بگرن وبەردەوامبن لەسەری بە موسڵمانی وملكەچی بۆ پەروەردگارتان لەسەر ئەو ئاینە بمرن .

مسلم لە جابری كوڕی عبداللە رضي الله عنهما ڕیوایەتی كردووە دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەری خودا ﷺ بوو سێ ڕۆژ پێش ئەوەی وەفات بكات دەیفەرموو : كەس لە ئێوە نەمرێت لە كاتێكدا نەبێت كە گومانی باشی بە خودا ﷻ هەبێت ، لەبەر ئەوە الفضیلی كوڕی عیاض دەڵێت : ﴿فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ مانای ئەوەیە گومانی باشتان بە پەروەردگارتان هەبێت ، ولەمبارەیەوە پرسیار كرا لە الشافعی گومانی خراپ بەرامبەر پەروەردگار چۆنە ؟ ، وتی : دڵەڕاوكێ ، وبەردەوام ترسان لە تووشبوون بە كارەسات ، وچاوەڕوان كردنی لە دەستدانی نیعمەتەكان ، هەموو ئەوانە لە گومانی خراپە بەرامبەر خودای میهرەبانی بە بەزەیی ؛ چۆن مرۆڤ دەتوانێت بە موسڵمانی بمرێت لە كاتێكدا چارەنووسی خۆی نازانێت ؟ دەبێت هەموو كات هەوڵبدات فەرمانەكانی خودا وپێغەمبەرەكەی ﷺ جێبەجێبكات وگوێڕایەڵ بێت بە گوێرەی توانای ولە یاساغیكراوەكان دوور كەوێتەوە ، بوخاری ومسلم لە سهلی كوڕی سعدی الساعدیەوە ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : پیاوی وا هەیە بە پێش چاوی خەڵكەوە كردەوەی كەسانی بەهەشتی ئەنجام دەدات وخۆی دۆزەخییە ، وپیاوی وا هەیە كردەوەی كەسانی دۆزەخی ئەنجام دەدات بە پێش چاوی خەڵكەوە بەڵام خۆی بەهەشتییە ، پەرستش كردنی خودا بە نیازپاكی ، ودوور بوون لە بیدعە وبیدعەكاران ، ولەسەر سوننەت بوون گەورەترین هۆكاری یارمەتیدەرن بۆ كۆتایی باش ومردن بە موسڵمانی ویەكتاپەرستی .

﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ ٱلْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنۢ بَعْدِى ۖ قَالُوا۟ نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٣﴾﴾ ئایا ئێوە ئامادەبوون لەو كاتەی كە یعقوب عليه السلام لە سەرەمەرگدا بوو بە منداڵەكانی فەرموو : چی

دەپەرستن دوای وەفاتی من ؟ ، وتیان : پەروەردگاری تۆ وپەروەردگاری باب وباپیرانت ئیبراهیم وئیسماعیل وئیسحاق ﷺ دەپەرستین ، کە تاك وتەنهایە وملکەچ وگوێڕایەڵی دەبین وموسڵمان دەبین .

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە باپیر لە جێگەی باوکە لە میرات وەرگرتندا ئەگەر باوك وەفاتیکردبوو وباپیر جێگەی دەگرێتەوە ، هەروەها مامیش وەك باوك وایە چونکە ئیسماعیل ﷺ مامی یعقوبە ﷺ ولە ڕیزی باب وباپیران ناوی هێناوە ، ومسلم لە ئەبوهریرەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ دەربارەی عەباسی مامی ﷺ بە عومەری ﷺ فەرمووە : نەتزانیوە کە مامی پیاو هاوتای باوکیەتی .

﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾﴾

ئەوانە "ئیبراهیم وئیسماعیل وئیسحاق ویەعقوب ونەوەکانی یەعقوب" ﷺ ئوممەتێك بوون وتێپەڕین ، وئەوەی ئەنجامیانداوە پاداشتی لای پەروەردگاریان وەردەگرنەوە ، وئێوەش ئەوەی ئەنجامی دەدەن پاداشتی وەردەگرنەوە ، وپرسیارتان لێناکرێت کە ئەوان چ کردەوەیەکیان ئەنجامداوە .

الجزء الأول — سورة البقرة

وَقَالُوا كُونُوا هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ تَهْتَدُوا ۗ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٣٥﴾ قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٦﴾ فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنتُم بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوا ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ ۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾ صِبْغَةَ اللَّهِ ۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ صِبْغَةً ۖ وَنَحْنُ لَهُ عَابِدُونَ ﴿١٣٨﴾ قُلْ أَتُحَاجُّونَنَا فِي اللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُخْلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطَ كَانُوا هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ ۗ قُلْ أَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللَّهُ ۗ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَادَةً عِندَهُ مِنَ اللَّهِ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٠﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ۖ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٤١﴾

٢١

ئەم ئایەتە وەڵامە بۆ جوولەكەكان وهەركەسێكی تر كە شانازی بە باب وباپیرانیەوە بكات ، بەبێ باوەڕهێنان وئەنجامدانی كردەوەی باش ، ئەو بانگەشە وخۆدانە پاڵە هیچ سود بە خاوەنەكانی ناگەیەنێت ، مسلم لە ئەبوهریرەوە ﵁ ڕیوایەتی كردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : هەركەس كردەوەی باشی فریادڕەسی نەبێت ڕەچەڵەك وبنەماڵە سودی پێناگەیەنن ، وئایەتەكە بەڵگەی ئەوەشی تێدایە كە مرۆڤ ئەنجامدەری كردەوەكانیەتی ، خودا ﷻ توانا وژیری پێبەخشیوە دەتوانێت بەهۆیەوە چاكە وخراپە لەیەك جیابكاتەوە وكردەوەكانی هەڵبژێرێت ، ئەوەش بیروباوەڕی ئەهلی سوننەیە بە پێچەوانەی جەبرییەكان كە دەڵێن : هەموو كردەوەكانی مرۆڤ پێی ئەنجامەدرێت وهەڵبژاردن بە دەستی خۆی نییە ، وقەدەرییەكان وموعتەزیلەكان كە دەڵێن : مرۆڤ خۆی كرداری خۆی دروست دەكات .

﴿وَقَالُوا كُونُوا هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ تَهْتَدُوا ۗ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٣٥﴾﴾ جوولەكە دەیانگوت : ببنە جوولەكە وگاوریش دەیانگوت : ببەنە گاور ڕێنمایی دەكرێن وهیدایەت وەردەگرن ، ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ : نەخێر بەڵكو ئێمە شوێن ئاینی پێغەمبەر

ئیبراهیم ﷺ دەکەوین ، کە بریتییە لە یەکتاپەرستی بە تەنها ، وهەرگیز لە هاوبەش بڕیاردەران نەبووە .

ئەحمەد لە ئەبو ئومامەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە ، دەڵێت : کۆمەڵێك خەڵك لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ دەرچووین یەکێکمان بە لای ئەشکەوتێکدا تێپەڕی بینی بڕێك ئاو وسەوزە وپاقلەمەنی تێدایە ، لەگەڵ نەفسی خۆیدا گفتوگۆی کرد بۆ ئەوەی لەو ئەشکەوتە بمێنێتەوە ، وواز لە دونیا بهێنێت ، لەو بارەیەوە ڕوخسەتی لە پێغەمبەری خودا خواست کە ڕێگەی بدات ، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : من نەنێردراوم بانگتان بکەم کە ببن بە جوولەکە وگاور بەڵکو نێردراوم بانگتان بکەم بۆ یەکتاپەرستی ، کە ئاینی پێغەمبەر ئیبراهیمە ﷺ وئاسانە ودەتوانرێت پەیڕەوی لێبکرێت .

﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ١٣٦﴾ موسڵمانان بڵێن : ئێمە باوەڕمان هێناوە بە خودا وبەوەی بۆمان دابەزیوە کە قورئان وسوننەتە وئەوەی بۆ ئیبراهیم وئیسماعیل وئیسحاق ویەعقوب ونەوەکانی وئەوەی بەخشراوە بە موسا وعیسا وئەوەی بەخشراوە بە پێغەمبەران ﷺ لە لایەن پەروەردگاریانەوە ، وهیچ جیاوازییەك ناکەین لە نێوان هیچ کامیان وئێمە ملکەچ وگوێڕایەڵی پەروەردگارین وموسڵمانین .

ئەبوعالیە والربیع وقتادە دەڵێن : ﴿ٱلۡأَسۡبَاطِ﴾ دوازدە کوڕەکەی یەعقوبە ﷺ هەریەکەیان کۆمەڵە منداڵێکیان لێبووە ، والخلیلی کوڕی ئەحمەد دەڵێت : وشەی ﴿ٱلۡأَسۡبَاطِ﴾ لە نەوەکانی یەعقوب وەکو وشەی هۆزەکانە لە نەوەکانی ئیسماعیل وبوخاری دەڵێت : هۆزەکانی

نەوەکانی یەعقوب عليه السلام دەگەیەنێت ، وئەوەی کە دەفەرموێت : جیاوازی ناکەین لە نێوانیان پێغەمبەران هەموویان خودا ڕەوانەی کردوون بە بیروباوەڕی یەکتاپەرستی ، بەڵام شەریعەتی هەریەکەیان جیاوازە خودا جل جلاله دەفەرموێت : ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴿٤٨﴾﴾(المَائِدَة) ، وپلە وپایەشیان جیاوازە ، مسلم لە ئەبوهرەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم فەرمووی : من گەورە وسەرداری نەوەکانی ئادەمم لە ڕۆژی قیامەتدا ، سوننەتە ئەم ئایەتە هەندێك جار لە ڕکاتی یەکەمی ئەو دوو ڕکاتە سوننەتەی پێش نوێژی بەیانی بخوێنرێت ، مسلم لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم لە دوو ڕکاتی سوننەتەکەی نوێژی بەیانی لە ڕکاتی یەکەمدا ئەم ئایەتەی سورەتی البقرەی دەخوێند کە دەفەرموێت : ﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِىَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٦﴾﴾ ، ولە ڕکاتی دووەمدا ئەو ئایەتەی آل عمرانی دەخوێند کە دەفەرموێت : ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾ ، وديسان مسلم لە ئەبوهریرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم لە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی نوێژی بەیانی : ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾و﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ دەخوێند .

﴿فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَواْ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍ ۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴿١٣٧﴾﴾ ئەگەر جوولەکە وگاورەکان باوەڕیان هێنا وەك ئەوەی ئێوە باوەڕتان هێناوە ، ئەوە بە ڕاستی هیدایەتیان وەرگرتووە ، بەڵام ئەگەر پشت هەڵبکەن وباوەڕ

نەهێنن وەك ئەو باوەڕهێنانەی ئێوە ، بێگومان لە ناکۆکی ودووبەرەکیدا دەژین ، وخودایان ﷻ بەسە کە سەرتبخات بەسەریاندا ولە شەڕ وخراپەیان پارێزراوت بکات ، کە بیسەرە وزۆر زانایە ووردەکاری هەموو کاروبارەکان دەزانێت .

﴿صِبْغَةَ ٱللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُۥ عَـٰبِدُونَ ﴿١٣٨﴾﴾ ئەمە ئاینی خودایە ئاینی کێ لە ئاینەکەی خودا جوانترە ؟ وئێمە تەنها بەندەی خوداین وتەنها ئەو دەپەرستین .

﴿صِبْغَةَ﴾ مانای ڕەنگە ووتراوە : مەبەست لە : ﴿صِبْغَةَ ٱللَّهِ﴾ ئاینی خودایە ، وبە ئاین وتراوە : ڕەنگ لەبەر دەرکەوتنی کاریگەری بەسەر ئەو کەسەوە کە پەیڕەوی لێدەکات ، کەسی ئایندار کاریگەری ئاین دەردەکەوێت لەسەر ڕواڵەت وهەڵسوکەوت ولە خودا ترسان وهەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵك وخوڕەوشت وهەموو جەستەی وژیانی بەگشتی ، وەك ڕەنگ وایە چۆن جلوبەرگ ڕەنگ دەگرێتە خۆی ، ئەو مرۆڤەش ئاین ڕەنگدەداتەوە لە هەموو هەڵسوکەوت وخوڕەوشت وئاکار وکرداری ، الواحدی دەڵێت : ئیبن عباس رضي الله عنهما وتی : گاورەکان ئەگەر منداڵیان لە دایکبووایە دوای شەش ڕۆژ بە ئاوێکیاندا دەکرد پێی دەگوترا : "المعمودی" بۆ ئەوەی پاکی بکەنەوە ودەیانگوت : ئەم پاکییە لەبری خەتەنەکردنە ، دوای ئەوە دەیانگوت ئێستا بووەتە گاور ، بە هەمان شێوە ئیبن ئەبوحاتم لە ئیبن عباسەوە رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە دەڵێت : نەوەکانی یەعقوب وتیان ئەی موسا عليه السلام : ئایا پەروەردگاری تۆ ڕەنگ دەکات ؟ فەرمووی : لە خودا بترسن ، پەروەردگاری بانگی کرد وفەرمووی : ئەی موسا عليه السلام پرسیاریان لێکردیت ئایا پەروەردگاری تۆ ڕەنگ دەکات ؟ بڵێ : بەڵێ : ڕەنگ دەکەم سور وسپی وڕەش وهەموو ڕەنگەکان لە سیفەتمدان ، خودا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ : ﴿صِبْغَةَ ٱللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُۥ عَـٰبِدُونَ ﴿١٣٨﴾﴾ .

﴿قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِى ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ ﴿١٣٩﴾﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بە جوولەکە وگاورەکان بڵێ دەتانەوێت بەڵگەمان بۆ بهێننەوە دەمەقاڵێ وململانێمان لەگەڵدا بکەن لەسەر بە تەنها پەرستنی خودای پەروەردگار کە پەروەردگاری ئێمەیە وپەروەردگاری ئێوەشە ، وئێمە لە کردەوەکانی خۆمان بەرپرسین وهەروەها ئێوەش لە کردەوەکانی خۆتان بەرپرسن ، وئێمە بە دڵسۆزی وتەنهایی دەیپەرستین .

ئەم ئایەتە سەرزەنشت ووەڵامی جوولەکە وگاورەکانە کە بە موسڵمانانیان دەگوت : شوێن ئاینەکانی ئێمە بکەون هیدایەت وەردەگرن ئەوە لە کاتێکدا کە پێچەوانەکەی ڕاستە ، چونکە موسڵمانان خودا بە تاك وتەنهایی دەپەرستن وهیچ هاوبەشی بۆ بڕیارنادەن ، ئەوان هاوبەش بڕیاردەدەن وجوولەکە دەڵێن : عوزەیر کوڕی خودایە ، وگاور دەڵێن : مەسیح کوڕی خودایە .

﴿أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطَ كَانُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ ۗ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٠﴾﴾ یان ئێوە دەڵێن : ئیبراهیم وئیسماعیل وئیسحاق ویەعقوب ونەوەکانی یەعقوب عليهم السلام جوولەکە یان گاور بوون ، بڵێ : ئایا ئێوە زاناترن لە خودا جل جلاله ؟! ، کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە گەواهیدانێکی لابێت لە خوداوە وبیشارێتەوە ، وخودا جل جلاله بێئاگا نییە لەو کردەوانەی ئەنجامیدەدەن .

ئەمەش هەڕەشەیەکی ترە لە خاوەن کتێبەکان کە دەیانزانی ئەو پێغەمبەرە بەرێزانە جوولەکە وگاور نەبوون بەڵکو موسڵمان ویەکتاپەرست بوون ، ولە کتێبەکانیاندا مژدەی هاتنی کۆتا پێغەمبەریان دەزانی ونکولیان کرد ، وهەروەها سەرنجڕاکێشانی تێدایە بۆ هەرکەس ڕاستی وگەواهیی ڕاستی لابێت ، کە نابێت بیشارێتەوە وبانگەشەی بۆ نەکات وسازش بکات لەو

ڕاستییەی کە لـەسەریەتی ، حەسەنی بەصری کاتێك ئەم ئایەتەی خوێندەوە وتی : سوێند بە خودا دەیانزانی کە پێغەمبەران بەرین لـە جوولـەکە وگاور .

﴿تِلۡكَ أُمَّةٞ قَدۡ خَلَتۡۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ وَلَا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٤١﴾ ئەوانە ـ ئیبراهیم وئیسماعیل وئیسحاق ویەعقوب ونەوەکانی یەعقوب ـ عَلَيۡهِمُ السَّلَامُ ئوممەتێك بوون وتێپەڕین وئەوەی ئەنجامیانداوە پاداشتی لای پەروەردگاریان وەردەگرنەوە ، وئێوەش ئەوەی ئەنجامی دەدەن پاداشتی وەردەگرنەوە ، وپرسیارتان لـێناکرێت کە ئەوان چ کردەوەیەکیان ئەنجامداوە .